

شازادە محەمەد دارا شکۆ

# کۆی دوو دەریاکە

(مجمع البحرین)

لێکۆڵینەوەیەکی فەلسەفی و عیرفانییە بۆ بەراوردکردنی
لێکچوونەکانی هیندۆیزم و ئیسلام



وەرگێڕانی

هاوێر کامەران حەمەئەمین

سەرچاوە/ اين هندو عيرفانى اسلامى.   نگارندە: داريوش شايگان.
ترجمە: جمشيد ارجمند. چاپ سوم، ١٣٨٧ تهران، نشر فرزان روز.

ناوی کتێب: کۆی دوو دەریاکە

نووسینی: شازادە محەمەد دارا شکۆ

وەرگێڕانی: هاوڕێ کامەران حەمە ئەمین

بابەت: لێکۆڵینەوەی عیرفانی

مۆنتاژی کۆمپیوتەر: سەیران عەبدولڕەحمان فەرەج

پێداچوونەوە: نەورۆز حسێن

دیزاینی بەرگ: نەرمین مستەفا

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

نرخ: ١٥٠٠ دینار

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

چاپی : یەکەم ساڵی ٢٠١١

کوردستان -سلێمانی

www.serdam.org

بۆ پەیوەندیکردن بە زنجیرەی کتێبەوە : kteb@serdam.org

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی (١٦٠٢)ی ساڵی ٢٠١٠ پێدراوە.

# كۆی دوو دەریاکە

## ( مجمع البحرين )

( لێکۆڵینەوەیەکی فەلسەفی و عیرفانیە بۆ بەراوردکردنی
لێکچوونەکانی هیندۆیزم و ئیسلام )

شازادە محەمەد دارا شکۆ

وەرگێڕانی لە فارسیەوە
هاوبیر کامەران حەمە ئەمین

سلێمانی ٢٠١١

گفت ان یار کزو گشت سر دار بلند
جرمش این بود که اسرار هویدا می کرد

حەزرەتی حافزی شیرازی

# ناوەڕۆک

# پێشەکیی وەرگێڕ

سەیرە... وەك حافزی شیرازی دەڵێت: تاوانی ئەوەی چووە سەر دار و لەسێدارە درا، کە مەبەستی مەنسوری حەللاجە، ئەوە بوو کە نهێنیەکانی وەحدەتی ئاشکرا کرد[1]. ئەوانەشی دەیانەوێت دووبەرەکیو جیاوازی پەرە پێ بدەن بە کەسانی داهێنەرو خاوەن مەزهەبی تازەو بیروڕای تازە دەناسرێنو ستایش دەکرێن.. ئەبێ لەگەڵ ئەو هەموو ترس لە مردنەی نێو مرۆڤ، ئەم هەموو حەز بۆ کوشتنە لە کوێوە بێت.

زۆرن ئەو چاوانەی دوانەییو جیاوازیەکان دەبینن‌و هۆکاری تەفرەقەو دووبەرەکیو جیابوونەوەو شەڕو نەهامەتین، بەلآم کەمن ئەو ڕوناك-ئەندێشانەی چاوەکانیان بڕیوەتە شتە هاوبەشەکانو لێکچوونەکان دەبینن‌و جیهانبینیان هۆکاری نزیکبوونەوەی نەتەوەو ئاینو مەزهەبە جیاجیاکانە لە یەکترو پێکهێنانی زمانێکی هاوبەشە بۆ پێکەوە ژیان.

---

1- ئەم وتەیەی حافزی شیرازی مانای ئەو هۆنراوەیەیە کە لە پەرەی پێشتردا هاتووە..گفت ان یار... لە دێرەکانی پێشتری ئەم دێرە شیعرەدا باسی ئەوە کراوە کە سالآنێك دڵ داوای جامی جەمی لە ئێمە ئەکرد ئەوەی خۆی هەیبوو لە بێگانەی داوا دەکرد.

کتێبی کۆی دوو دەریاکە (مجمع البحرین) کە لە نوسینی شازادە "محمد داراشکۆ"یە، وەکو بە ناوەکەیدا دیارە هەوڵێکە بۆ کۆکردنەوەی دوو بەحری گەورە لە زانستو زانیاری کە بۆ ساڵانێکی دوورو درێژ وەکو چۆن هۆکاری ڕزگاربوونی هاوبەش-بینان بوون، هۆکاری کوشتارێکی زۆریش بوون. ئەو دوو بەحرەش بەحری عیرفانو زانینی ئیسلامیو بەحری عیرفانو زانینی هیندۆسی بوو.

محمد داراشکۆی کوڕی شا جیهانی گورکانی، بە هۆی ئەو تێکەڵییەی لەگەڵ سۆفیەکانو جیهانی عیرفانی ئیسلامی لە لایەكو سوامیو پاندیتو جیهانی عیرفانی هیندۆیزم لە لایەکی ترەوە هەیبووە، ویستی بووە هەردوو زانستی ناوەکی ئیسلامیو هیندۆسی لە دووتوێی کتێبێکی پوختو کورتدا کۆبکاتەوەو بیسەلمێنێت کە ئەم دوو ڕێچکەیە تەنها جیاوازیەکەیان لە وشەو زماندایە نەك لە تێڕوانینیان بۆ شتەکانو جەوهەرو ناوەڕۆك. هەڵبەت کاتێك دەڵێم زانینو زانستی ئیسلامی و زانینو زانستی هیندۆیزم، مەبەستم نیە ئەو دوانە جیا بکەمەوە، چونکە لەڕاستیدا ئەو دوانە یەکنو تەنها ڕووپۆشی مێژوویی ئەوان لەیەکتر جیادەکاتەوە کە داراشکۆ بەجوانی باسی دەکات.

ئەم شاکارەی داراشکۆ کە تەمەنی زیاتر لە سێ سەدەو نیوە، مایەی فەخرو بەگەورەگرتنە کە کەسێك لە مێژوویەکی وا کۆندا ویستبێتی جیاوازییەکان لەناو ببات نەك لە ڕێگەی سیاسیو جەنگەوە، کە

بەڕاستی ئەمە ڕێگە چارەنیە، بەڵکو لـە ڕێگـەی فیکـری‌و ئەقڵیـەوە. داراشکۆ ویستوویەتی نەك بە عارفان بەڵکو بە دانایان‌و زانایانی ئایینی هەردوو ئایین بسەلمێنێت کە ئەوان هاوبەشـییان زۆرەو پێویـستە زیـاتر لەیەکتر نزیك ببنەوەو خەڵکی بۆ بینینی ئەو شتە هاوبەشانە هان بـدەن نەك هانیان بدەن بۆ دووبینی و دووبەرەکی.

عارفەکان، ئەوانەی بە شوێن خوداوەن، جەوهەری شتەکان‌و ئایینەکان‌و دیاردەکان دەبینن، بۆیە جیاوازی ناکەن لـە نێـوان ئایینەکانـدا، بـەڵام زانایانی ئایینی کە زیاتر بەو کەسانە دەڵێن کە سەرقاڵی شەرعن، نـەك خودا، دەیانەوێت دینێك لە دینەکان، ئایینێك لە ئایینەکان، ڕێگەیـەك لە ڕێگەکان شی بکەنەوە، ئەمانە زیاتر چاو بۆ جیاوازیـەکان دەگێـڕن‌و هەندێ جاریش سودی تایبەتی‌و ئابووری لە پشت دیاردەی دوو-بینیەوە هەیە، کە بەڕوونی لە خەلافەتەکان و شانشینە ئایینیەکاندا دەیبینین.

داراشکۆ یەکەمین هەوڵدەرە لەم پێناوەداو هەوڵەکەشی ئامانجی خۆی پێکابێت یان نا، هەر شایستەی ڕێـز و بەگەورەگرتنـە، چـونکە ئەگـەر مێژووی هاتنی ئیسلام‌و بڵاوبوونەوەی بخوێنینەوە لە هینـدسـتان، ئـەوا بۆمان دەردەکەوێت کە چەند پێویست بووە لەسەردەمی داراشکۆدا وەها هەوڵێك بێتە بوون. لەم بارەیەوە "داریوشی شـایگان" گـەورە نوسـەرو فەیلەسوفی ئێرانی دەڵێت:

"کۆی دوو دەریاکەی داراشکۆ، هەوڵێکی ڕاستگۆیانەیە لەسەر بنچینەی یەکبوونی مەفاهیمەکانی تەسەوفی ئیسلامیو ئایینی هیندۆسی، داراشکۆ لە ڕاستیدا خەونی یەکخستنی ئایینەکانی لەسەردا بوو، بە تایبەت لە کۆمەڵگەی فرەئایینی هیندستاندا دەیویست کە هەردوو ئاینی ئیسلامو هیندۆیزم پێکەوە گرێ بدات، کە وەکو دەڵێن ئەگەر لەم ڕێگەیەدا سەرکەوتوو بوایە، نیمچە قارەی هیند دابەش نەدەبووە سەر هیندستانو پاکستان، بەمەش مێژووی ئاسیا دەگۆڕا".

داراشکۆ وەك لەچەند شوێنێك ئاماژەی پێدەدات کە ئەم هەوڵەی بۆ دانایانی هەردوو ئایینە نەك بۆ کەسانی عەوام و کورت-بین، بەلاّم بە داخەوە جیهان بە کامی عارفان نیەو لەسەر پێچکەی نەزانان بەڕێوە دەچێتو بە دەگمەن چەرخی گەردوون ڕوو دەکاتە دانایانو هەمیشە دەیانکاتە سووتووی کورت-بینی و جیهان-بینی دوالیزم و تەنگی نەزانانو شێوە پەرستانی کۆمەڵگە. لەسێدارەدانی خودی نوسەری ئەم کتێبەش بەڵگەی ئەو ڕاستیەیە. لێرەوەیە کە دەڵێم هەوڵدان بۆ یەکخستنی جیهان، زیاتر لە خەونێکی خۆش دەچێت، هەموانیش دەزانین خەونی خۆش لە خەونی ناخۆش باشترە.

ئەو باسانەی داراشکۆ لێیان دواوە، لە گرنگترین باسەکانی هەردوو ئایینن کە بەسەر زارەکی و ڕووکار وا دێنە بەرچاو دژ بە یەك بن، بەلاّم لە ناوەڕۆك و جەوهەردا هەر یەکێکن، لەو مەسەلانەش نمونەی

یەکتاپەرستی ئایینی هیندۆس‌و دابەشی جیهانەکان‌و مەسەلەی سرووش و ئــازادبوون‌و پێغەمبەرایــەتی‌و کتێبــە پیرۆزەکــان‌و ڕۆح‌و خــوداو زەمەنەکان‌و چەند باسێکی تر.

هەرچەند لە هەندێ شوێندا داراشکۆ دەیتوانی ڕوونترو باشترو قــوڵتر باسی ئەو بابەتانە بکات، بەڵام بەوپەری سەرسوڕمانەوە دەڵێم کــە لــە هەندێ شوێندا شازادە داراشکۆ زۆر بە سانایی و بەوپــەری ســادەییەوە زانیاریــەکان پێــشکەش دەکــات، بــۆ نمونــە وەك لــە مەســەلەی ئــیش "کارمــا"و باکــان "پڕاناکــان"و چــەند باســێکی تــر. بــەڵام لەوانەیــە ویستبێتی خوێنەر هان بدات بۆ گەڕان بە شوێن ئەو بابەتانەدا کە پێم وابێت خۆی دەیتوانی زۆر جوانترو زیاتر ڕوونیان بکاتەوە.

لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوە بکەم کــە بەنــدە پــاش گــەڕانێکی زۆر، تێکستی فارسی ئەم کتێبەم لە تاران دەستکەوت لە ژێر ناوی "ایین هند و عیرفان اسلامی" لە نوســینی "داریــوش شــایگان"و وەرگێڕانــی لــە فەرەنسیەوە "جمشید ارجمند" بەچــاپی ســێهەم کــە لــە لایــەن دەزگــای بڵاوکردنەوەی "فرزان روز"ەوە چاپ‌و بڵاوکراوەتە.

لە ڕاستیدا ئەم کتێبە (واتە ئایینی هیندۆس و عیرفــانی ئیــسلامی) نامەی دکتۆرای دکتۆر داریوشی شایگانە کە بە فەرەنسی نوسیویەتی و شەرحێکی تەواوە لەسەر کتێبی ((مجمــع البحــرین))ی داراشــکۆ. واتــە نامەی دکتۆراکەی لەسەر کتێبەکەی داراشکۆیەو لە کۆتایی نامەکەشدا

"مجمع البحرين"ی وەرگێراوەتە سەر زمانی فارسیو زۆر جوان داینـاوەتـەوەو من ئەم وەرگێڕانەم کردووەتە کوردی.

کەمی کات دەرفەتی نەدا هەموو نامەی دکتۆراکەش وەرگێڕمە سەر زمانی کوردی کە لە ڕاستیدا کارێکی زۆر نایابە، بەڵاّم ئەگەر خودا یار بێت ئەو کارە بۆ دوارۆژ.

وەرگێرانی ئەم کتێبەی داراشکۆ ئەگەڕێتەوە بۆ حەزی ناوەکی خۆم بۆ گەران بە شوێن وەلاّمی هەندێ لەو پرسیارانەی کە داراشکۆ وەلاّمیان دەداتەوە، چونکە لێکچوونەکانی هەردوو ئاین وایان لیّ کردبووم بلێم زۆر کەمن ئەو شتانەی ناهاوبەشن و دەبێت لێکچوونەکە لەوە زیاتر بێت کە من دەیزانم. سەرەنجام هەرواش بوو، لێکچوونەکان زۆر زیاتر بوون لە شتە دژ بەیەکەکان، ئەو شتانەشی دژ بە یەکن لەم دوو ئایینەدا زیاتر ئەو شتانەن کە کلتورو عادات سەپاندوویانە بەسەر ئایینەکەداو لە ناوەڕۆکی ئایینەکە بەدوورن. بۆ نمونە وەکو زاڵبوونی هەندێ کەلتوری بوومی یان کەلتوری ئاریای کۆن بەسەر ئایینی هیندۆسدا، وە لە ئیسلامیشدا زاڵبوونی کەلتوری عەرەبیو هەندێجار بەربەری و جولاّنەوە سیاسیەکان.

وەنەبێت تەنها ئەم کەلتورانەش بەلکو تەنانەت پێشکەوتنی جیهانی تەکنەلۆژیو ئامێر، کاریگەری زۆری هەبووە لەسەر ڕۆشتنی ئایینەکان بە ڕێرەوێکی وادا کە ئایینزاکان خۆیان ئاگاداری نەبن و نەزانن بەرەو

کویَ دەیانبات. مەبەستم لەم دێڕەی دوایی ئەوەیـە بڵـێم ئەگـەر ئێمـە خەیاڵی زانینمان لەسەر شەپۆلەکانی ئۆقیانوسی شەرعی ئایینەکان کـۆ بکەینەوە ئەوا وردە وردە ئەم شەپۆلانە بەرەو پێش دەچن و شێوەکەشیان دەگۆڕرێت هەربۆیە وتراوە مرۆڤـ دووجار لە ئاوێکدا مەلە ناکـاتو لـە نمونەی ئـەو شـەپۆلانەش دەرکـەوتنی خـەواریجو موعتـەزیلـەو شـیعەو سوننیو وەهابیو سەلەفیو برایانی سەفاو ئەحمەدیەکانی هینـدسـتانو تەریقەتەکانی تەسەوفو مەزهەبـە جیاوازەکـانی نێـو سـوننەو شـیعەو دەیان مەزهەبی تریشە لەناو ئیسلام. لە هیندۆیزمیشدا دەرکەوتنی هەر دە بەشەکەی سانیاساو بە دەیـانو سـەدان ڕێگـەی جیـاوازی بـوداییو نانکیو ماهاڤیرایی. هەر بۆیە باشترە بۆ گەڕانەوە بۆ ڕەسەنایەتی هـەر تەریقەت یان ئایینێك بگەڕێینەوە بـۆ قـولایی ئۆقیانوسـی مەعریفـەی سەرەتایی ئەو ئایینەی کە بە نەگۆڕیی دەمێنێتەوە.

هەر بۆیە بە پێویستی دەزانم بە ڕوناك-ئەندێشانی کورد بڵێم لە نێـوان هەموو بیروڕاو فەلسەفە بەتایبەت ڕۆژئاواییـەکانـدا ڕۆحێکـی هاوبـەش هەیە کە بە دۆزینەوەی گەلێ گـرێ کـوێرە دەکرێتـەوە. هـەروەها بـەو خوێنەرانەش کە کەمتر لەسەر بیروڕای هیندی شت دەزانن، بزانن ئەگەر لە هیندستان کەسانێك هەبن مشك، مار، مەیمون یان گا بپەرستن مانای نیە ئەوانە هیندۆسی بن و هیندۆسـی لـەوە پێکهاتبێـت. ئـەوەی لـەم

کتێبەدا دەیبینی هیندۆسیەتی ڕاستەقینەیە بێ گروپ و گروپگەرایی و مەزاهیبی جیاواز.

بەو هیوایەم ئەم کتێبە چاوی ئەو کەسانە بکاتەوە کە حەساسیەتیان بە ئایینی هیندۆیزم هەیەو تێبگەن لەوەی خودا پەیامی خۆی بە سەدانو هەزاران زمان گەیاندووە بە مەرودمی پەیتا پەیتا لەناوچووی سەر ئەم زەویە، بەلاّم هەمووی لە ناوەڕۆکو جەوهەردا یەك ماناو مەبەستیان هەیە، ئەگەرچی نەزانانی هەردوولا لەو ڕاستیە بێ ئاگا بن و یەکتر بە کافر ناوزەد بکەنو خوێنی یەکتر بکەنە کاسەی زەویەوە، خوێنێك کە لە هەمووواندا سورە.

**(هاوبیر کامەران)**

**سلێمانی ٢٠١٠/٣/٧**



**شازادە محەمەد داراشکۆ**

# ژیانی شازاده داراشکۆ

بە هاتنی ئایینی ئیسلام بۆ هیندستان، لە سەرەتاکانی سەدەی شازدەدا سیلسیلەی گورکانیانی هیند دروست بوون کە "شاجیهان" یەکێك لە پادشایانی ئەم سیلسیلەیەیە. شاجیهان بە دە پشت دەگاتەوە بە "تەیموری گورکانی". [2]

محمد دارا شکۆ[3] کوڕە گەورەی ((شاجیهان))ی سوڵتانی موسڵمانە مەغۆلەکانی هیندستان بووە. دایکی داراشکۆ ناوی ((مومتاز مەحەل))ی کچی ((ئاصەف خان)) بووە کە ((تاج مەحەل))ی ((ڕۆحی ئێران لە جەستەی هیند))ی بۆ دروست کراوەو بە ناویەوە ناو نراوە. دارا شکۆ لە ٢٠ ی مارسی ١٦١٥ کە بەرابەرە بە ٢٩ی سەفەری ساڵی ١٠٢٤هیجری، لەدایك بووە وەك خۆی لەکتێبی ((سفینة الاولیاء))دا باسی دەکات.

---

2- بڕوانە ئەم سەرچاوەیە: اوپانیشاد. ترجمە: محمد داراشکۆ. با مقدمە و تعلیقات و لغتنامە و اعلام بسعی و اهتمام: دکتر تارا چند، دکتر جلالی نائینی. ص ١١٨

3- محمد داراشکۆ کوری شا جیهای کوڕی جەهانگیر کوڕی ئەکبەری کوری هومایونی کوڕی ظهر الدین محمد بابری کوری عمر شیخ ی کوری ئەبو سەعیدی کوڕی محمدی کوڕی میرانشای کوری تەیموری گورکانیە.

شازادەی هونەرمەندو دانا، تەنها ٤٤ و هەندێك دەڵێن ٤٥ ساڵ ژیاوە تـا لە کۆتاییداو لە بەرواری ١٦٥٩/٨/٣٠ بەدەستی (ئاوڕەنگ زیب)ی بـرای بـە تۆمەتی مورتەدیو زەندیقی، بەشێوەیەکی زۆر وەحشیانە کـوژراو تەنانـەت تەرمەکەشیان نەشت، لەبەر ئەوەی پێیان وا بووە کە موسـڵمان نیـەو نابێـت بشۆررێت. ئاوڕەنگ زیب بە بوونی باوکی (بەلاّم باوکێکی نـەخۆش) هـەموو براکانی تری خۆی کوشتو خۆی لەسەر تەختی سەڵتەنت دانیشت.

محمد صالح لاهـوری، نوسـەری ((شـا جیهـان نامـە)) نازنـاوی ((گـوڵی یەکەمین گوڵستانی شاهی)) دەدات بە داراشکۆ کە بە پێی حروفـی ئەبجـەدی کۆی ژمارەکانی دەکاتە ساڵی لەدایك بوونی داراشکۆ. [٤]

داراشکۆ کەسایەتیەکی دیاری ئەو سەردەمەی هیندسـتان بـووەو نزیکیـەکی زۆری لەگەڵ دانایانی ئەو کاتەی هینـد هـەبووە بـە تایبـەت بابـالال داس و گوروی حەوتەمی سیخەکان (هار ڕای)، کە زۆر هاوڕێی دارا بووەو جارێکیش بەهۆی دەرمانی سروشتی و زانستی ئایورڤیداوە کـە "هـار ڕای" زۆر لێـزان بووە تیایدا، دارای لە مردن ڕزگار کردووە.

---

٤- بڕوانە ئەم سەرچاوەیە کە نامەی دکتۆراکـەی داریوشـی شـایگانە بـە فەرەنـسی لەسەر کتێبی کۆی دوو دەریاکە: ایین هنـدو عیرفـانی اسـلامی. نگارنـدە: داریـوش شایگان. ترجمە: جمشید ارجمند. چاپ سوم، ١٣٨٧ تهران، نـشر فـرزان روز. لاپـەرە (١٠).

دەوترێ داراشکۆ بە هۆی تووکی شێرەوە کـە بـۆی دەکرێتـە خواردنەکەیـەوە دەچێتە لێواری مردنو کاتێك "هار ڕای" چارەسـەری دەکـات، دارا هەنـدێ دیاریی دەداتێ کە یەکیان پەشمینێکی سووری سەرشان دەبێت کـە داراشـکۆ زۆری خۆش ویستوە.

داراشکۆ بە ئایین موسڵمان بووە بە مەزهەب حەنەفی و بـە تەریقـەت سـۆفی سـەر بـە تەریقـەتی قـادریو موریـدی سـۆفی بـەناوبانگ "میـان مـیر"ی مورشیدی سیلسیلەی قادری بووە لـە هینـد و تەریقـەتی لای ((مـەلا شـای بەدەخشانی)) وەرگرتووەو هەربۆیە زۆر کاریگەر بووە بـە تەسـەوفو سـۆفیە گەورەکانی پێش خۆیو ئەو سەردەمە، دەبینین خاوەنی نوسینگەلی گرنگە لە بـارەی سـۆفیەکانەوە کـە تیایـدا ژیاننامـەی گـەلێ لـە سـۆفیەکان بـە مامۆستاکانی خۆشیەوە دەخات ڕوو.

دەوتـرێ کاریگـەری گـەورەی "میـان مـیر" دەگەڕێتـەوە بـۆ یـەکێك لـە چـاوپێکەوتنەکانی داراشـکۆ لەگەڵیـدا لـە ((لاهـور)) لـە سـاڵی ١٠٤٣ی هیجریو هەروەها داستانی نەخۆشیەکەی دارا کـە بـۆ مـاوەی چـوار مـانگ نەخۆش دەبێتو بە پەرداخێك ئاو چاك دەبێتەوە کە "میـان مـیر"ی شـێخی بەناوبانگی تەسەوف نزای بەسەردا خوێندووە.

داراشـــکۆ لای زۆر کـــەس زانـــستی وەرگرتـــووە. ســـەرەتا لای ((مـــەلا عبداللطیف سلطان پور)) زانستە شەرع و باوەکانی ئەو ڕۆژانـەی وەرگرتـووە. پاشان لای ((میرەك شـێخ)) وانـەی خوێنـدووە. دواتـر لای ((شـێخ ئەحمـەد

دەهلەوی)) زانستی تێکستەکانی خوێندووەو بۆ ماوەیـەکیش لەبـەر دەسـتی ((مەلا عبدالرشید عماد))ی خۆشنووسدا بووە.

دارا بۆ بەهێزکردنی زمانە سانسکرێتیەکەی، سودی لە زۆر کەس بینیـوە بـە تایبەت ((بابا لعل داس)) کە یەکێك لە دانایانی هینـدۆس بـووەو داراشـکۆ کتێبێکیشی لە بارەیەوە بەناوی ((پرسـیار و وەڵام)) نوسـیوە. بێجگـە لـەوە لەگـەڵ دانایـانی ئـەو سـەردەمەی هینـد وەکـو ((هـار رای)) و ((سـەرمەد کاشانی)) و ((شێخ ناسرمحمد)) مەلاشاه پەیوەندی زۆری هەبووە.

زۆرن ئەو کارە گەورانەی داراشکۆ کردوونی، بێجگە لەوەی کە ئالبومێکی گرنگی لە وێنەو دەسـتخەتو زۆر شـتی تـر دروسـت کـردووەو پێـشکەشی هاوسەری خۆشەویستی خۆی (واتە نـادرە بیگـەم) کـردووە، کـە دوای خـۆی هەندێکی فەوتاو هەندێکیشی بە شاردراوەیی ماوەتەوە تا لەم دواییانـەدا لـە مۆزەخانەی نیشتمانی نمـایش کـرا. داراشـکۆ خـاوەنی یەکـەمین وەرگێڕانـی ئوپانیشادەکانە لە سانسکرێتیەوە بۆ سەر زمانی فارسی. وەکو بە باسـکردنی خۆیـدا دەردەکـەوێت، شـازادە داراشـکۆ ویـستویەتی ئوپانیـشادەکان کـە تێکستگەلی مەعنەوی‌و پیرۆزی هیندۆسەکان بوون بە شێوەیەکی زۆر جـوان‌و ورد وەرگێڕێتە سەر زمانی فارسی تا فارسی زوبانان‌و موسڵمانان لێی بـەئاگا بن‌و ئەو کارەشی بە هاوکاری گەلێ لە مامۆستایانی گەورەی هیندۆسی ئـەو سـەردەمە کـردووەو پـەنجا ئوپانیـشادی زۆر جـوان وەرگێـراوە کـە یەکـەم وەرگێڕانی ئوپانیشادەکانە بـۆ سـەر زمـانێکی تـر. شـایەنی ئامـاژەیـە کـە

ئوپانیشادەکانی ناوناوە ((سر اکبر)) واتە ئەو نهێنییەی ناو قورئان کە لە قورئاندا بە ((سر اکبر)) هاتووە و ئەمە هۆکاری زیاتر تووڕەبوونی موسڵمانەکان بوو لە دەوروبەری دارا.

هەرچەند داراشکۆ لە دەوڵەتەکەی باوکیدا پایەی لە هەموو براکانی تری بەرزتر بووە پاش چەند جار بەرزکردنەوەی پلەکەی، دواجار خاوەنی لێپرسراوێتی نزیکەی شەست هەزار سوپای پیادەو چل هەزار سواری گالیسکەدار بووە، بەڵام بەهۆی ئەشقی بۆ زانین‌و خۆشویستنی باوکیەوە کە پیاوێکی زانست-دۆست بووە کەمتر ئالۆدەی حوکمڕانی بووە. لەگەڵ ئەوەدا کە داراشکۆ ماوەیەك فەرمانڕەواو گەورەی خاندیس، الله ئاباد، بنارس، پەنجاب، گوجرات، مولتان و کابوڵ بووە، بەڵام زیاتر بەڕێوەبردنی ئیداری بە جێنشینەکانی خۆی سپاردوە.

یەکێك لە بیروراکانی دارا ئەوەبووە کە هەمیشە ووتویەتی ((الله بس و ما سوی الله هوس)) واتە خوا بەسە و بێجگە لە خوا هەمووی هەوەس‌و حەزە. ئەمە خۆی لەخۆیدا مەبەستی قووڵی عیرفانی ئیسلامی و سانیاسای هیندۆسە کە لە داراشکۆدا یەکیان گرتووەو داراشکۆ وەك شیعاری خۆی بەکاری هێناوە. ژیاننامەنووسی ((ئاورینگ زیب))ی برای داراشکۆ لە ((عالەمگیر نامە))دا بەو شێوەیە باسی داراشکۆ دەکات:

"لە دین لای داوەو تەنانەت ئەوەی لە لای سانیاساو یۆگیەکان پێ دەوترێت ناوەکانی خوا، داراشکۆ لەسەر ئاڵتون‌و ئەڵماس‌و زمڕود

ئەینوسێت‌و دەیكات بە خۆیەوەو بڕوای پێیان هەیەو جیاوازی ناكات لە نێوان ئیسلام‌و هیندۆیزمدا".

بەهەر حاڵ، ئەگەر نوسینی تێكستی ((كۆی دوو دەریاكـە))و وەرگێرانـی ئوپانیـشادەكان لـە لایـەن داراشـكۆو چاوچـنۆكی‌و شـەرع-پەرسـتی‌و تێنەگەیشتنی ئاورنگ زیب، هەروەها خیانەتی ((مەلەك جەوانی)) ئـەفغانی نەبووایە، كە لە پـاش شـكانی داراشـكۆ لـە شـەڕی ((دێـڕۆڕا)) لـە نزیـك ((ئەجمەر)) ئەوی ڕادەستی ئاورنگ زیب كـرد، پـاش ئـەوەی دارا پـەنای بـۆ بردبوو، ئـەوا دارا شـەهید نـەدەكراو لەوانـە بـوو گـەلێ تێكـستی دیكـەی هاوشێوەی كۆی دوو دەریاكەی بهێنایەتە بوون كە هـەوڵێكی زۆر پـیرۆزە بـۆ لەناوبردنی دووبەرەكی و شەڕی نێوان ئاینزاكانی هیندستان.

مردنی داراشكۆ زیانێكی گەورەی بە هونەرو ئەدەب‌و فەلسەفە گەیاند لـە هیندستان‌و باوكی‌و بەتایبەتیش خوشكەكەی كە لەگەڵ دارادا سـۆفی قـادری بوون، زۆر دڵگران بوون‌و یەكێك لەو خەفەتە زۆر گەورانـەی كـە بـە هۆیـەوە شاجیهانی گورگانی گیانی لەدەست دا، مردنـی داراشـكۆی كـوڕی بـوو كـە دواجار لەپاڵ باپیرەیدا خرایە چاڵەوە.

# بەرهەمەکانی دارا شکۆ

لەگەڵ ئەوەدا کە داراشکۆ سەرقاڵی ئیدارەکردنی وڵاتو گەلێ کاری سیاسی بووە، بەڵام گەلێ کتێبو نوسینی بەپێزو گرنگی لە دوای خۆی بەجێ هێشتووە. ئەو کتێبانەی کە پەیوەستن بە ئایینی ئیسلام و عیرفانی ئیسلامیەوەو دارا پێش وەرگێرانی ئوپانیشادەکان نوسیونی ئەوانەن:

١. **سفینة الاولیاء** . یەکەمین کتێبی داراشکۆیە و لە تەمەنی ٢٥ ساڵیدا نوسیویەتی و باس لە ژیانی پێغەمبەری ئیسلامو خەلیفەکانی ڕاشدین و دوانزە ئیمامەکەی ئیشعەو حاڵ و ئەحواڵی شێخەکانی تەریقەتی قادریو جونەیدیو نەقشبەندیو چەشتیو وهرەوەردیو کوبرەویەو هەندێ لە عارفانو سۆفیە بەناوبانگەکانی تری جیهانی تەسەوف دەکات بە ژن و پیاوەوە. بەگشتی لەم کتێبەیدا کە قەبارەیەکی گەورەی هەیە، باسی ژیان و باری ڕۆحیی زیاتر لە ٤١١ کەسایەتی ئیسلامی دەکات.[٥]

٢. **سکینة الاولیاء** . دووەمین کتێبی داراشکۆیە و لە تەمەنی بیست و هەشتەمین ساڵی خۆیدا نوسیویەتی. لەم کتێبەدا ژیانی

5- بڕوانە هەمان سەرچاوەی پەراوێزی یەك، لاپەڕە ١٩٨ بۆ ٢٠٥

شێخ عبدالقادر گەیلانیو حەزەرتی میان میر و مەلا شای مورشیدی داراشكۆ و هەندێ لە مورید و یارانی میان میر باسكراوە.

٣. **رساله حق نما.** سێهەمین نوسینی داراشكۆیەو باس لە جیهانی ناسوتو مەلەكوتو جەبەرووتو لاهوت دەكات و یەكێتی بوون (وحده الوجود) شی دەكاتەوە.

٤. **حسنات العرفین.** ئەم كتێبەی لە ساڵێ ١٠٦٢ ی هیجری نوسیوەو زیاتر باس لە شەتەحیاتو قسەی عارفانی ئیسلامی دەكات كە كاتی مەستی كردوویانەو داراشكۆ ئەو قسانە نمایش و روون دەكاتەوە.

٥. **مجمع البحرین.** كۆی دوو دەریاكە كە ئەم كێبەی بەردەستی بەرێزت لەساڵی ١٠٦٥ ی هیجریدا نوسراوە كە داراشكۆ لە تەمەنی ٤٢ ساڵیدا بووەو دوو یان سێ ساڵ پاش ئەم نوسینە كوژراوەو ئەم كتێبەش یەكێك لە هۆكارەكانی كوشتنی داراشكۆ بووە. داریوشی شایگان لەو بڕوایەدایە كە بوونی شاعیری گەورەی هیندۆس ((جاگانات میشرا)) هۆكارێكی سەرەكی بووە بۆ نوسینی ئەم كتێبە[٦]. كۆی دوو دەریاكە لە ساڵی ١١٨٥ ی هیجری لە لایەن

6- بڕوانە ئەم سەرچاوەیە: ایین هندو عیرفانی اسلامی. نگارندە: داریوش شایگان. ترجمە: جمشید ارجمند. چاپ سوم، ١٣٨٧ تهران، نشر فرزان روز. لاپەرە (١٢).

شێخ ئەحمەدی میسریەوە کراوە بە عەرەبی (مولوی محفوظ الحق) کردویەتی بە ئینگلیزی و ساڵی ١٩٢٩ لە ((کەلکەتە)) بڵاوی کردۆتەوەو ئەمساڵیش کە ساڵی ٢٠١٠ یە، واتە نزیکەی ٣٥٤ ساڵ پاش نوسینی ئەم کتێبە وەرگێردرایە سەر زمانی کوردی.

٦. **سر اکبر (ئوپانیشدەکان)**. وەرگێرانی پەنجا ئوپانیشادە کە بە ئوپانیشادە بەناوبانگەکانی هیند دەژمێررێن. لە ساڵی ١٦٥٧ داراشکۆ ئەم ئوپانیشادانەی لە سانسکرێتیەوە وەرگێراوەتە سەر زمانی فارسی. دارا شکۆ یەکێك لە باشترین سانسکرێت-زانەکانی سەردەمی خۆی بووە کە وەکو زمانی دایك کە فارسی بووە سانسکرێتی زانیوە.

٧. **دیوانی دارا شکۆ**. ئەم دیوانە چاپ نەکراوە تەنها لە مۆزەخانە ماوەتەوەو دوو نوسخەی هەیە، یەکیان لە ئێرانو یەکیان لە کەلکەتە لە هیندستان. ئەم دیوانە پێك دێت لە چەند غەزەلێك و چەند چوارینەیەکی داراشکۆ.

یەکێك لە هۆنراوەکانی ئەوەیە کە دەڵێت:

**بەهەشت ئەوەیە لێی نەبێ مەلا - دووربێ لەدەنگی مەلاوو غەوغا**
**خاڵی بێ جیهان لە هاواری ئەو - لەفەتوای بێ جێ، بێ پەروایی ئەو**

**لەو شارەی مەلا ماڵی لێ دەکا - دانایی دەڕوا و لەوێ بار دەکا**

لە دونیا تا هەیت گەلێ ئازاد بە - لە بانگی قادری تۆ خەبەردار بە. [٧]

٨. **نامە عیرفانیەکان**. ئەم کتێبە ئەو نامانەن کە داراشکۆ گۆڕیونیەتەوە لەگەڵ مامۆستاو دۆستەکانی و هەموو پێك دێن لە باس و خواسی فەلسەفی و عیرفانی.

٩. **تەریقەی حەقیقەت**. ئەم کتێبە لەبارەی گەورەیی خوداو بێهێزی و بێ-توانایی مرۆڤەوە دەدوێت کە ناتوانێت خۆی بدۆزێتەوەوگیرۆدەی جیهانی مادە بووە. هەروەها باسی سەراب-بوونی جیهانی ماددە دەکاتو پێی وایە ئەم جیهانە بوونی نیە و بوونەکەی وەکو سەرابێکی هەڵخەڵەتێنەرە.

١٠. **ریسالەی پرسیار و وەڵام**. ئەم کتێبە گفتوگۆیەکی نێوان داراشکۆو بابالعل داسە لە ساڵی ١٠٦٢ی هیجری ئەنجام دراوە، واتە حەوت ساڵ پێش شەهید بوونی داراشکۆ. ئەم تێکستە کە وەرگێڕراوەتە سەر زمانی ئینگلیزیو فارسیو فەرەنسی. لەم کتێبەدا داراشکۆ دەپرسێت: "چ جیاوازیەك هەیە لە نێوان خالقو مەخلوق! واتە دروستکەر و دروستکراودا! هەندێ دەڵێن وەکو درەخت و تۆ و وایە؟"

---

7- بە باشم زانی لە بری دەقی ئەسڵی ئەم هۆنراوەیە یەکسەر وەرگێرانەکەی دابنێم و وەرگێرانەکەشم بەم شێوەیە کردە هۆنراوە.

بابا وەلاّم دەداتەوە کە: "جیاوازی لەنێوان تۆو و درەختدا نیە، ئەوان لازم و مەلزومی یەکترن. بەدیهێنەر وەکو دەریایەو بەدیهێنراو وەکو شەپۆلەکانی دەریایە. هەرچەند لە زاتدا یەکن، بەلاّم لە هێزدا جیاوازن‌و لە هێزدا بەدیهێنەر بەدیهێنەرەو بەدیهێنراو بەدیهێنراو، واتە خودا خودایە و بەندەش بەندە".

١١. **بهاگاڤادگیتا**. داراشکۆ ئەم کتێبە پیرۆزەی هیندی لە ساڵی ١٦٥٦ وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسی، کە یەکێك لە ئیشە زۆر جوانەکانی داراشکۆیە. هەرچەند ئەم وەرگێرانە هەندێ جار دراوەتە پاڵ (ئەبولفەزڵ) بەلاّم راسترە کە وەرگێرانەکە هی داراشکۆیە.

بێجگە لەم کتێبانە هەندێ کتێبی دیکە دەدرێتە پاڵ داراشکۆ، کە نازانرێت تا چەند وایە! بەلاّم گومان هەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو کتێبانە لە نوسینی داراشکۆ بن‌و لە هەندێ سەرچاوەی کۆنیشدا بە ناوی ئەوە باسیان کراوە، یەکێك لەو کتێبانەش ((نادر النکات))ە.

# پێشەکیی داراشکۆ

بسم الله الرحمن الرحیم

به نام انکه او نامی ندارد          به هر نامی که خوانی سر بر ارد[8]

سوپاسی زۆر بۆ ئەو تاقانەیەی کە دوو زلفی کوفرو ئیسلامی کە خاڵی بەرابەری یەکن، بەسەر ڕوخساری جوان و ڕازاوەی خۆی دەرخستوەو وە هیچ کامیشیانی نەکردوە بە ڕوپۆشی روخساری نازەنینی خۆی.

کفر اسلام در رهش پویان          وحده لاشریك له گویان

ئەو لە هەموو شتێکدا دەردەکەوێت، وە هەموو شتێك لەوەوە دەردەکەوێت. یەکەم ئەوەو کۆتایی ئەوە.

---

8-بە ناوی ئەو زاتەوە کە ناوی نیە و بە هەر ناوێك بانگی بکەیت وەڵآم دەداتەوە.

همسایه و همنشین و همره همه اوست — در دلق گدا و اطلس شه همه اوست
در انجمن فرق و نهان خانه جمع — بالله همه اوست ثم بالله همه اوست[٩]

وه درودی بێ سنور لەسەر دەرکەوتەی کۆتاییو هۆکـاری دروسـتبوونی جیهان موحەمـەدی موستەفا (ص) وه لـەسەر یار و کەسانی بێت.
لە پاشاندا...

بەندەی هەژار محەمـەد داراشـکۆ کـە پـاش دۆزینـەوەی هەقیقـەتی هەقیقەتەکانو لێکۆڵینەوە لەسەر نهێنیە وردەکـانی مەزهـەبی هـەقی سۆفیەو بەدەستهێنانی ئەم بەخشیە گەورەیە، لەهەوڵی ئەوەدا بـوو کـە تێبگات لە کونهی بیرو یەکتاپەرستانی هیندو لێکۆڵەرانی ئـەم نەتـەوە کۆنە. لەگەڵ هەندێ لە کامڵانی ئەوان کە گەشتبوون بە کۆتایی ڕیازەت و تێگەیـشتن و دەرك‌و مەبەسـتی تەسـەوف‌و دۆزینـەوەی خـوداو هەڵسەنگاندنی تەواو، بەردەوام گفتوگۆی هەبوو قسەی دەکرد، بێجگـە لە جیاوازی وشەیی هیچ، بۆی دەرکەوت و زانی و هیچ جیاوازیەکی تری نەبینی. لەم ڕووەوە قسەکانی هـەردوو لای بـەراورد کـردو هەنـدێ لـە

٩- دراوسێ و هاوماڵ و هاو ڕێگە هەموو ئەوە، ئەوەی لە بـەرگی گـەداو پاشـادایە هەموو ئەوە، لە کۆڕی جیابونەوەو پەنهان ئامێزی کۆدا، سوێند بەخوا هەموو ئەوە، دیسان سوێند بەخوا هەمووی ئەوە.

قسەکان کە بۆ گەڕۆکەکان بە شوێن راستیدا پێویستو سودمەندە، ئامادە کردووەو کتێبێکی ئامادە کردووە، چونکە کۆی راستەقینەو زانینی دوو هۆزی خوداناس بوو ناونرا ((کۆی دوو دەریاکە)) بە پێی وتەی گەورەکان کە دەڵێن: "تەسەوف: ئینساف و وازهێنانە لە داوا" کەواتە هەر کەسێك ئینسافی هەیە و لە ئەهلی تێگەیشتنە، تێدەگات کە لە لێکۆڵینەوەی ئەم قۆناغانەدا چەند قوڵ بۆتەوە، بەدڵنیاییەوە کە تێگەیشتوان شانسێکی فراوانیان لەم کتێبەدا هەیە، وە کەم-بیرانی هەردوو لا هیچیان لە سودەکانی دەست ناکەوێت. وە ئەم لێکۆڵینەوەیەم بە پێی هەڵهێنجانو زەوقی خۆمو بۆ کەسانی نزیکی خۆم نوسیوەو کارم بە نەزانەکانی هەردوو لا نیە.

خواجەی ئەحرار ((نهێنیەکەی پیرۆز بێت)) فەرموویەتی:

**"ئەگەر بزانم کافرێك بێ ئاگا زەمزەمەی یەکتاپەرستی دەکات، دەچم و گوێی لێ دەگرم و لێی فێردەبم و منەتباری دەبم"**

داوای سەرکەوتن و پشتیوانی لە خودا دەکەم.

# باسکردنی ڕەگەزەکان

بزانە کە ڕەگەزەکان پێنجن و ماددەی هەموو دروستکراوە ناسوتیەکان ئەم پێنجەن.

یەکەم: ڕەگەزی گەورە، کە ئەهلی شەرع پێی دەڵێن: عەرشی گەورە "عرش اکبر".

دووەم: با.

سێهەم: ئاگر.

چوارەم: ئاو.

پێنجەم: خاك.

بە زمانی خەڵکی هیندستان ئەم ڕەگەزانە بە پانجە بهوتە "Panja Bhuta" ناوزەد دەکەن.

١. ئاکاشا (Akasha).

٢. ڤایو (Vayu).

٣. تیجەس (Tijas).[10]

10- تیجاس بەرابەرە بە گەرمی کە هەمان ئاگنیە واتە ئاگرە.

٤. جەلە (Jala). [١١]

٥. پریتیڤی (Prithivi).

ئاكاشاش سێ جۆرە:

١. بهوت ئاكاشا (Bhutakasha). [١٢]

٢. مەنەس ئاكاشا (Manasakasha). [١٣]

٣. چید ئاكاشا (Chitakasha). [١٤]

بەوەی كە دەوری ڕەگەزەكانی داوە دەڵێن بهوت ئاكاشا.
بەوەی كە دەوری دروستكراوەكانی داوە دەڵێن مەنەس ئاكاشا.
بەوەی كە دەوری هەموو شتێكی داوەو لە هەموو شوێنێك هەیە، دەڵێن چید ئاكاشا.

---

11- جەلە بە مانای "ئاو" دێتو مەبەست لە "ئاپاسە" كە بە زمانێكی فەلسەفیانەتر دەردەبڕێ.

12- بهوت واتە ڕەگەزو ئاكاشا واتە فەزا، فەزایەك كە دەوری ڕەگەزەكانی داوە.

13- مەنەس واتە زهن و هۆكاری دەركەوتنی دروستكراوەكانە.

14- چید یان چیت واتە هۆش.

وە چید ئاکاشا (ئاجانونی) لەدایك نەبووە، واتە تازە نیەو هیچ ئایەتێکی قورئانو ڤێدا کە کتێبی ئاسمانین ئاماژە ناکەن بە دروستبوونو لەناوچوونی.

لە چید ئاکاشا یەکەم شتێك کە پێکهات ئەشق بوو کە بە زمانی یەکتاپەرستانی هیند دەڵێن (مایا) [١٥]و ئەهلی ئیسلام دەڵێن (**کنت کنزا مخفیا، فاحببت ان اعرف، فخلقت الخلق**)، لەسەر ئەوەیە، واتە: من وەك کەنزێکی پەنهان بوم، حەزم کرد بناسرێم، هەر بۆیە دروستکراوەکانم دروستکرد.

وە لە ئەشق ڕۆحی گەورە کە "جیڤاتمانە"[١٦] پەیدا بوو کە پێی دەڵێن هەقیقەتی محمدی کە ئاماژە بە ڕۆحی گشتگیری بالاّیە (د.خ)و یەکتاپەرستانی هیند بە "هیرەنیاگاربها"[١٧] و "ئاڤاستاتما"[١٨] ناوی دەبەنو ئاماژەیە بە قۆناغی هەرە جوان "جمال".

پاش ئەو ڕەگەزی بایە کە پێی دەڵێن هەناسەی ڕەحمان. وە لەو هەناسەیە با پەیدابوو، چونکە هەناسە بەهۆی ڕاگرتنەوە لە لایەن حەزرەتی وجودەوە لە شاردنەوەیدا گەرمی دروستکرد. لە "با" ئاگر پەیدا بوو، چونکە لەو هەناسەدا سیفەتی ڕەحمانیەت هەبوو ساردبوویەوەو لە ئاگر ئاو پەیدابوو. بەلاّم چونکە ڕەگەزی با و ئاگر

---

15- Maya
16- Jivatman
17- Hiranyagarbha
18- Avasthatma

بەهۆی ئاسکیانەوە هەستپێکراو نینو ئاو بە چاو ئەوانەوە هەست پێکراوە. بەهی هەستپێکرانیەوە هەندێك دەڵێن سەرەتا ئاو دەرکەوت پاش ئەو خاكو ئەم خاکە وەکو کەفی ئاو وایە. وەکو شیرێك کە لە ژێریدا ئاگر هەبێت و بکوڵێت و کەف بکات.

**چە دانستم کە این دریایی بی پایان چنین باشد**
**بخارش اسمان گردد کف دریا زمین باشد**[١٩]

وە بەپێچەوانەی ئەمەوە لە "قیامەتی گەورە" دا کە پێی دەوترێت (ماها پرالایا) [٢٠] یەکەم خاك لەناودەچێت و ئاو هەڵێدەلوشێت و ئاگر ئاو وشك دەکاتەوە و با ئاگر دادەمرکێنێتەوە و با لەگەڵ ڕۆحی گەورە دەچێتە نێو ماها کاشاوە.

**(کل شی هالك الا وجە)**

واتە: "هەموو شتێك لەناودەچێت تەنها روی الله ی گەورە نەبێت کە ماها کاشایە".

**(کل من علیها فان ویبقی وجە ربك ذا الجلال والاکرام)**

19- چۆن بزانم ئەم دەریا فراوانە وەهایە کە هەڵمەکەی دەبێتە ئاسمان و لەپی دەستی دەریاش دەبێتە زەوی.

20- Maha Pralaya

واتە:" هەموو ئەوەی لەسەر زەویە لەناو دەچێت و ڕووی پەروەردگاری تۆ دەمێنێتەوە کە خاوەنی گەورەیی‌و پیرۆزیە".

لەم ئایەتەدا کە تایبەتە بە فەنای هەموو شتەکان، وشەی "وجه" کە بەکارهاتووە مەبەست لێی ((ماها کاشا))یە کە لەناوچوونی نیە، گەر نا دەیفەرموو ((کل شی هالك الا هو)). واتە:" هەموو شتێك لەناو دەچێت تەنها زاتی ئەو نەبێ". بەندی ((ڕوو)) بۆ ماها کاشایە، کە وەکو لەشی تیواری ئەو زاتە پیرۆزەیە.

هەروەها خاك بە زمانی هیندی ((پریتیڤ))ی پێدەڵێن کە هەموو شتێك لەو بووەو لەویشدا لەناودەچێت، بەبەڵگەی ئایەتی پیرۆزی:

(منها خلقناکم و فیها نعیدکم و منها نخرجکم تارة اخری)

واتە: "لەو خاکە ئێوەمان دروست کردووەو دەتان گێڕینەوە ئەو خاکەو لەو خاکەش جارێکی تر دەرتان دێنینەوە ".

# باسی هەستەکان

هاوشانی ئەم پێنج ڕەگەزە پێنج هەست هەیە کە بە زمانی خەڵکی هیند پێی دەڵێن "پانجا جاناندری" [٢١] و پێك دێن لە :

لوت، زمان، چاو، گوێ، دەست، کە بەزمانی هیند پێیان دەڵێن گرانا (Grana)، ڕاسانا (Rasana)، چاکشو (Chakshu)، شروترە (Shrutra)، تڤەك (Tvac).

وە بە مەحسوساتەکانیش دەڵێن گاندها (gandha) و ڕاسا (Rasa) و ڕوپا (Rupa)و شابدا (Shabda) و سپارشە(Sparsha).

وە هەریەکێك لەم پێنج هەستە لە ڕەگەزی یەکێك لە ڕەگەزەکانەو دەگەڕێنەوە بۆ یەکێکیان.

لوت دەگەڕێتەوە بۆ خاك و لەکاتێکدا هیچ کام لە ڕەگەزەکانی تر بوونیان نیە تەنها خاك نەبێت کە لوت بۆنی دەکات.

زمان پەیوەستە بە ئاوەوە چونکە ئاو لە زماندا دەردەکەوێت.

چاو پەیوەندی بە ئاگرەوە هەیە چونکە دەرکی ڕەنگەکان و نورەکەشی هەردوو بە چاو دەردەکەون.

---

21- Panja janandri واتە پێنج هۆکارەکەی زانین.

وه بەرکەوتن پەیوەندی بە باوه هەیه چونکه هۆکاری هەستکردن بـه هەستپێکراوەکان، بایه.

هەروەها گویّ پەیوەسته بە رەگەزی گەورەی ((ماها کاشا))وەو هۆی بیستنی دەنگەکانەو لەرێگەی گوێوه ڕاستی ماها کاشا بـۆ ئـەهلی دلّ ئاشکرا دەبێتو خەڵکی لێی بەئاگا ئەبن و ئەمەش کارێکه هاوبەش له نێوان سۆفیەتو یەکتاپەرستانی هیند، سۆفیەکان بەم کاره دەڵێن ئاوازو ئەوان بە دهیانا[٢٢] ناوی دەبەن.

هەسته ناوەکیەکانیش پێنجن:

هەستی هاوبەش (حس مشترك)، خـەیاڵکار (متخیلـه)، بیرکـەرەوه (متفکر)، یادەوەری (حافظة)، و واهیمه (واهمه).

وه لای ئـەهلی هینـد چـوارن بـودهی[٢٣]، مەنـەس[٢٤]، ئاهـەنکاره[٢٥]، چیته[٢٦] و بە کۆی ئەم چواره دەڵێن ئانتەرکەرەنا[٢٧] که وەکو پێنجـەمی ئەوانه.

---

22- Dhyana

23- Buddhi واته ئەقڵ.

24- Manas واته زهن.

25- Ahankra واته منێتی.

26- Chita واته هۆش.

27- Antarkarana

چیتە نەریتێکی هەیە کە پێی دەڵێن (سات پراکریتی)[٢٨] و ئەم نەریتە قاچەکانی ئەون کە ئەگەر بیبڕێن لە ڕاکردن دەوستێت.

یەکەم: بودهی واتە ئەقڵ. بودهی ئەوەیە کە بەرەو خێر دەڕواتو بەرەو شەڕ ناڕوات.

دووەم: مەنەس کە پێکدێت لە دڵ. وە مەنەس دوو هێزی هەیە: سەنکەلپا[٢٩] و ڤیکەلپا[٣٠] واتە ویست و هەڵوەشاندنەوە.

سێهەم: چیتا کە پەیکی دڵەو کارەکەی ڕاکردنە بە هەر لایەکداو جیاوازی لە نێوان خێر و شەڕدا ناکات.

چوارەم: ئاهەنکارە واتە ئەوەی شتەکان دەداتە پاڵ خۆی، ئاهەنکارە تایبەتمەند پاراتمانە بەهۆی مایاوە. مایا بەزمانی ئەوان ئەشقە.

وە ئاهەنکارە سێ بەشە: ساتڤا[٣١] و ڕاجاس[٣٢] و تاماس[٣٣].

١. ئاهەنکارە ساتڤا، واتە گیانا ساتڤا ڕوپا[٣٤] کە قۆناغی بالآیە، ئەوەیە کە پارماتمان دەڵێت هەرچی هەیە منم. ئەم قۆناغە دەورە دەری هەموو شتێکە، (الا انه لکل شی محیط) واتە: "داناو بەئاگایە، ئەوە کە دەوری هەموو شتێکی داوە". هەروەها کە دەوترێت: (هوالاول والاخر و

28- Sat Prakriti
29- Samkalpa
30- Vikalpa
31- Satva
32-Rajas
33-Tamas
34- Gyanasatvarupa

**الظاهر والباطن)**. واتە: "ئەوە سەرەتا و ئەوە کۆتایی و ئەوە دەرکەوتەو ئەوە شاراوە".

٢. ئاهەنکارە ڕاجاس، مادهیامایە، کە نێوەندەو ئەوەیە کە ڕوو دەکاتە جیڤاتمانو دەڵێت زاتی من بێبەریە لە لەش و ڕەگەزەکان و جسمیەت پەیوەندی نیە بە منەوە. **(لیس کمثلە شیء)** واتە هیچ شتێکی وەکو ئەو نیە. **(فان الله غنی عن العالمین)** واتە: "خودای گەورە بێ نیازە بەرامبەر دەرخستنی جیهان".

٣. ئاهەنکارە تەمەس. ئەمیش ئادهامایە[35] کە نزمترینەو لە ئاڤیدیاوەیە، واتە قۆناغ-بەندیی حەزرەتی وجودە. نزمترین بوونی لەو ڕووەوەیە کە لە کۆتایی نزمبونەوەو کۆتو بەندی جۆراو جۆری خۆیدا، نەزانیو بێ ئاگایی دەداتە پاڵ خۆییو تەنها لە ڕووکاری هەستەکی دەڕوانێت. دەڵێت کە من و تۆ دووڕین لە قۆناغی یەکبونەوە. **(قل انی انا بشر مثلکم)** واتە: "ئەی موحەمەد بڵێ منیش هیچ نیم تەنها مرۆڤێك نەبێت وەکو ئێوە".

35- Adhama

یۆگاڤاشیستا[٣٦] دەفەرموێت کاتێك حەزرەت ویستی زۆر بێت، تەنها بەو ئیرادەیە بوو بە پاراماتمان[٣٧] و کە پەیوەستبوونەکە زۆر بوو، ئاهەنکارە هاتە بەرهەم، چونکە دیسان پەیوەستبوون زیاد بوو ماهاتەتڤە[٣٨] کە ئەقڵە دروست بوو ناوی بۆ دانرا و لە سەنکەلپە[٣٩] و ماهاتاتڤا "من" پەیدابوو کە "پراکریتی"شی پێ دەڵێن.

وە لە سەنەلپاو مەنەس پێنج گیانەندری پەیدا بوو کە بیستن و بەرکەوتن و بینین و بۆن و تامە. و لە سەنکەلپاو ئەم پێنج گیانەندریەش پێنج کارمەندریا[٤٠] پەیدابوو کە ئەندامەکانن و پێیان دەوترێت لەش.

---

36- Yoga Vashistha ئەم کتێبە لەلایەن گەورە دانای هیندی ڤاشیستاوە نوسراوەتەوە بۆ کوڕی یەکێك لە حاکمە گەورەکانی هیند بۆئەوەی بتوانێت هەم وەك دانایەکی رۆحانی بژی و هەم وەك سەرکردەیەکی جیهانی.

37- Paramatman

38- Mahatatva

39- سەنکەلپا یان سەنکەلپە بەمانای ویست دێت، ویستێك ناوەکی کە دەبێتە هۆی پێکهێنانی شتەکانی جیهانی دەرەکی. ئەم تیۆرە هەمان ئەو تیۆرەیە کە نیچە لە رێگەی شۆپنهاوەرەوە گەشتە ئەو خاڵەی کە بڕوای پێ بهێنێت و لەژێر ناوی (ئیرادەی هێز)دا دایبڕێژێتەوە.

40- Panja karmadryani واتە پێنج ئەندامەکەی کار کە لە فەلسەفەی سانکیادا دەست و چاوو لوت و زمان و گوێ و دەزگای زاوو زێیە.

کەواتە پاراماتمان کە باوکی ڕۆحەکان (ابو الارواح)ە ئەم بەریەستانەی لە خۆی دروستکرد، خۆی بەستۆتەوە وەکو چۆن کرمی ئاوریشم تاڵەکانی ئاوریشم لە دەمیەوە دەردەهێنێتو خۆی تێ دەپێچێ، وەکو تۆوی درەخت کە درەخت لە خۆیەوە دەردێنێتو خۆی لە درەختەوە دەچێتە بەندی لقەکانو گەڵاکانو گوڵەکان کە لە پێش دەرکەوتنی جیهانەوە شاراوە بوون (الحال ذات) لە جیهاندا پەنهانە.

# باسی کار

گەرچی ئیش[41] لای یەکتاپەرستانی هیند شێوازی زۆری هەیە، بەڵام پێیان وایە باشترینی هەموو ئیشەکان (ئیجاپا)یە[42]. ئیجاپا ئیشێکە کە لە خەوو بێداریدا، بێ مەبەست و ئیختیار لە هەموو ڕۆحدارەکان هەمیشەو هەردەم دەردەچێت و ئایەتی (و ان شیء الا یسبح بحمده ولکن لاتفقهون تسبیحهم) ئاماژەیە بە هەمان ئیجاپا.

بە هەناسە هەڵمژین دەڵێن (سۆ) [43] و بە هەناسەدانەوە دەڵێن (هام)[44]، واتە "ئەو منم". سۆفیەکان وتنەوەی ئەم دوو واژەیە بە (هو الله) دەزانن کە لە چونە ناوەوەی هەناسە (هو)و لەچوونە دەرەوەیدا (الله) دەردەکەوێت.

---

41- مەبەست لە ئیش کارمایە karma کە کار وکاردانەوەی کارەو ئەم یاسایە باس لەوە دەکات کە لە چاك چاك و لە خراپ خراپ دەچنیتەوە.

42- Ijapa واتە زیکری بەدەوام کە خۆ بەخۆ لە دڵەوە دروست دەبێت.

43- SO

44- Ham

## باسی تایبەتمەندیەکان

خوای پاك و بێگەرد دوو تایبەتمەندی هەیە لای سۆفیەکان، "جلال"و "جمال" کە هەموو بوون لە ژێر ئەو دوو تایبەتمەندیەدایە کە پێی دەڵێن "تری گۆنا"[٤٥]. ساتڤا، راجاس و تاماس. ساتڤا واتە دروستبوون و ڕاجاس واتە مانەوەو و تاماس واتە لەناوچوون "فەنا". لەبەرئەوەی سۆفیەکان مانەوەیان لەنێو سیفەتی "جمال" دا بینیوە، دوو بۆچوونیان داناوە. هەرسێ ئەم سیفەتانە لە یەکتردانو بە فریشتەکانیشیان دەڵێن تری مۆرتی (Tri murti) کە "برەهما"[٤٦] و "ڤیشنۆ"[٤٧] و "ماهیشڤارا"ن[٤٨]، وە بەزمانی سۆفیەکان پێی دەڵێت "جبریل" و "میکایل" و "ئیسرافیل".

"برەهما" فریشتەی بەدیهێنانە کە جبریلە و "ڤیشنۆ" فریشتەی مانەوەیە کە میکاییلە و "ماهیشڤارا"ش فریشتەی فەنابوونە کە ئیسرافیلە. "ئاو"و "ئاگر"و "با"ش پەیوەستن بەم فریشتانەوە. ئاو پەیوەستە بە جبریل و ئاگر بە میکاییل و با بە ئیسرافیلەوە، ئەم سێ شتەش لە هەموو گیانداراندا ئاشکران.

45- Tri Gona واتە سێ گۆناکە کە مەبەست لە ساتڤا و راجاس و تاماسە.

46- Brahma

47- Vishnu

48- Mahishvara یان Shiva

"برەهما" کە فریشتەی ئاوە لە زماندا، بوو بە دەرکەوتەی کـەلامی ئیلاهیو وتە لەوەوە دەرکـەوت. "ڤیـشنۆ" کـە ئـاگرە لـە چـاودا کـە ڕووناکی و نور و بینین لەودا پەیدابوو. وە "ماهیشڤارا" کە "با"یە لـە تودا هەردوو "نەفخی صور" لەوە پێکهات کە دوو هەناسەیە کە ئەگەر وەستا ئەوا لەناو دەچێت.

"تری گۆنـا" سـێ تایبەتمەنـدی هەیـە کـە دروسـتبوون و مانـەوەو لەناوچـوونە. دەرکەوتـەی ئـەم تایبەتمەندیانـەش برەهمـا و ڤیـشنۆ و ماهیشڤاران کە لە هەموو بونەوەرەکاندا ئاشکران.

سەرەتا دروست دەبێت، پاشان بۆ کاتێکی دیاری کراو دەمێنێتـەوەو دواتر لەناو دەچێت. هەروەها شاکتی کە هێزی ئـەم تایبەتمەندیـە پێـی دەڵێن "تری دێڤی". بەوەی کە لە تری مورتیەوە پەیدا بوو پێی دەڵـێن "ساراسڤاتی"[٤٩] و "پارڤاتی"[٥٠] و "لاکشمی"[٥١].

"ساراسڤاتی" پەیوەستە بە "ڕاجاگۆنا"و "برەهمـا"وە، "پارڤـاتی" پەیوەستە بە "تاماگۆنا"و "ماهیشڤارا"وە، وە "لاکشمی" پەیوەسـتە بە "ساتگۆنا" و "ڤیشنۆوە".

---

49- Sarasvati
50- Parvati
51-Lakshmi

# باسی ڕۆح

ڕۆح دوو بەشـە: یـەکیان ڕۆح و ئـەوی دی گـەورە، ڕۆح لـە زمـانی فوقەرای هیند بەم دوو ڕۆحە دەڵێن ئاتمان و پاراماتمان.

زاتی پاك کە "زۆر" و "پەیوەست" بوو، چ بە شـێوەیەکی تیـوارو چ بە شێوەی چڕ بەهۆی سنورداربوونی لە قۆناغی تیواریدا پێی دەڵێن ڕۆح "ئاتما". وە لە قۆناغی چڕی لەشدا پێی دەڵێ "شریرا"[٥٢].

وە زاتێك کە بە پێناسەی یەکەم ناسـرا کـە ڕۆحـی گەورەیـەو پلـەی تاقانەیی هەیەو هەموو ڕۆحەکان لەودان، پێـی دەڵـێن پاراماتمـانو بـە "گەورە ڕۆح" ناوی دەبەن.[٥٣]

ئاو و شەپۆلەکەی وەکو لەش و ڕۆحن، کە "شەریرا"و "ئاتمـان"و کـۆی شەپۆلەکان لە ڕووی گشتەوە "گەورەڕۆح" و "پاراماتمان"ە.

ئاوی پاك لە مـەقامی حەزرەتی وجودو "شۆدها"[٥٤]و "چیتانا"یە.[٥٥]

---

52- Shrira بە مانای شتێك کە بوونی هەبێت بە پێوەرەکانی مادە، بـەرزی و پـانی هەبێت ئەگەرچی زۆر کەمیش بێت وەکو ئەتۆم.

53- لێرەدا داراشکۆ وشەی (ابو الارواح) واتە بـاوکی ڕۆحـەکان بـەکار دێنێـت کـە وشەیەکی زۆر عـەرەبیـە، مـن کردوومـە بـە گـەورە ڕۆح کـە مانـای تـەواوی وشـە سانسکریتیەکەشە ، پارا واتە گەورە و ئاتمان واتە ڕۆح.

54- Shodha

55-chitana

# باسی پڕاناکان[٥٦]

ئەو پڕانا (با)یەی لە لەشی مرۆڤدا دەجولێت لەبەرئـەوەی لـە پێـنج شوێندایە ناوی پێنجەکەیە: پڕانـا[٥٧]، ئاپانـا[٥٨]، سـامانا[٥٩]، ئودانـا[٦٠]، ڤیانا.[٦١] "پڕانا" جولەکەی لە لوتەوە تا پەنجەی پێیـە. هەناسـەدانەوە تایبەتمەندی ئەم پڕانایەیە.

جولەی "ئاپانا" لەکۆمەوە تا وەتەیە. وە ئـەم بایـە بـە دەوری ناوکـدا بازنەی بەستوەو مایەی ژیانیەتی.

"سامانا" لە سنگ و ناوکدا دەجولێت.

"ئودانا"، توانا و جولەی ئەم لە قورگ تا مێشکە.

هەروەها "ڤیانا" کە ناوەوەو دەرەوە پڕە لەم بایە.[٦٢]

---

56- لە نوسخە ئەسڵیەکەدا نوسراوە باسکردنی باکان، بەڵام وشەی با کە داراشکۆ لە بەرامبەر وشەی پڕانا بەکاری هێناوە مانابەخش نیـە لـە کوردیـدا هـەر بۆیـە وشـە سانسکرێتیەکەم بە باشتر زانی.

57- Prana
58-Apana
59-Samana
60-Udana
61-Vyana

62- بۆ شارەزای زیاتر لەسەر پڕاناکان دەتوانی بگەڕێیتـەوە بـۆ کتێبـی "زانـست و فەلسەفە ڤیدایەکان" لە نوسـینی وەرگێـڕی ئـەم کتێبـە و چـاپی دەزگـای چـاپ و پەخشی سەردەم.

# باسی چوار جیهانەکە

لای تەسەوف بەگشتی ئەو جیهانانەی کە هەموو دروستکراوەکان ناچارن پێیدا تێپەڕن چوارن: ناسوت، مەلەکوت، جەبەروت، لاهوت.
وەهەندێ دەڵێن پێنج و جیهانی نمونەیی"میثال" دێننە ناوەوە. وە هەندێ کە جیهانی "میسال" لەگەڵ جیهانی "مەلەکوت" بەیەك دەزانن پێیان وایە چوارن.

وە بەڕای زاهیدەکانی هیند "ئاڤاستها"[٦٣] کە پێکدێت لە چوار جیهانەکە ئەم چوارەیە:
جاگرەت (**Jagrat**)، سواپنا (**Swapna**)، سوشوپتی (**Sushupti**) و توریا(**Turya**).
جاگرەت بەرامبەرە بە ناسوت کە جیهانی دەرکەوتەی دەرەکیو بێدارییە.
سواپنا بەرابەرە بە مەلەکوت کە عەلەمی رۆح و جیهانی خەوە.
سۆشۆپتی بەرابەرە بە جەبەروت کە تیایدا وێنەکان لە هەردوو جیهاندا من و تۆی تێدا نیە. چ بە چاوی داخراوەوە دابنیشی چ بە چاوی کراوەوە.

---

63- Avastha

زۆر لە فوقەرای هەردوولا لەم بارەیەوە شارەزا نین، گەورەی هۆز مامۆستا ئەبولقاسم جونەید (نهێنیەکەی پیرۆز بێت) هەواڵی دابوو فەرموی "تەسەوف ئەوەیە کاتژمێرێك دابنیشی بێ غەمباری".

شێخی ئیسلام خواجە عەبدواللە ی ئەنساری وتی بێ تیمار چیە؟

دۆزینەوەی بێ گەڕان و بینینی بێ ڕوانین ، لەکاتێکدا بینەر لە ڕوانیندا هۆکارە. کەواتە کاتژمێرێك دانیشتن بێ غەم هەمان ئەو حاڵەتەیە کە وێنەکانی جیهانی ناسوتو مەلەکوت لەو کاتژمێرەدا لەبیردا نەبن. وە ئەوەش کە مەولانای ڕۆمی (نهێنی پیرۆز بێت) فەرموویەتی:

خواهی کە تا بیاب، یك لحظە ای مجویش

خواهی کە تا بدانی، یك لحظە ای مدانش[٦٤]

چون در نهانش جویی، دوری ز اشکارش

چون اشکار جویی، محجوبی از نهانش[٦٥]

چون زاشکار و پانهان، بیرون شوی بە برهان

پاها درازکن خوش، می خسب در امانش[٦٦]. [٦٧]

---

64- بۆ ئەوەی بیدۆزیتەوە، تەنانەت چرکەیەك مەگەرێ بە شوێنیدا. بۆئەوەی بزانیت، تەنانەت چرکەیەك مەزانە.

65-چونکە ئەگەر بەشوێن پەنهانی ئەودا بگەڕێیت ئاشکراکەیت لێ دوور دەکەوێتەوە. ئەگەریش بە شوێن ئاشکراکەیدا بگەڕێیت پەنهانەکەی نابینی.

وە "توریا"[٦٨] بەرابەرە بە "لاهوت" کە زاتی پاکەو دەورەدەرو گشت و کۆکەرەوەی سەرچاوەی هەرسێ جیهانەکەیە.

ئەگەر گەڕانی مرۆڤ لە ناسـوت بـۆ مەلـەکوت و لـە مەلـەکوت بـۆ جەبەروت و لە جەبەروت بۆ لاهوت بێـت، ئەمـە پێـشکەوتنی ئـەوە و ئەگەر حەزرەتی "ڕاستەقینەی ڕاستەقینەکان" کە یەکتاپەرستانی هیند "ئەڤەسانە" ی پێ دەڵێن لە مەقامی لاهوت بێتە خوارو لە ەبـەروت و مەلەکوت تێپەرێت، سەرەنجام گەڕانەکەی دەکەوێتە جیهانی ناسـوتەوە. وە ئەوەی سۆفیەت بە قۆناغەکانی دابەزینی دادەنێن و پێیان وایە چوارە و هەندێك پێیان وایە پێنجە، ئاماژەیە بۆ هەمان مەبەست.

---

66-وە کاتێك ڕزگارت بوو لە نهێنی و ئاشکرا، ئیـدی قاچـی لـێ ڕاکێـشە و لـەپاڵ دڵنایی و ئەمانی ئەودا بحەسێرەوە.

67- مەبەستی مەولانا ئەوەیە کە ئەگەر لە دونیـای ڕۆحانیـدا بگـەڕێیت بـە شـوێن خودادا کە هەمان دونیای جاگرەت و ناسوتە، ئـەوا خـودات لـێ ون دەبێـت کـە لـە جیهانی مەلەکوت و جەبەروتـدا هەیـە. وە ئەگـەر تـەنها لـە جیهـانی مەلـەکوت و جەبەروتدا بگەڕێی بە شوێن خودادا، ئەوا خودا نابینی لەنێو ناسوتدا. کەواتە لەکوێ دەگەڕێیت بەشوێن ئەودا لە کاتێکدا ئەو لە هەموو شوێنێکە.

68-Turya

# باسی دەنگ

نادا[٦٩] هەمان هەناسەی ڕەحمانە کە بەهۆی واژەی ببە(کن)وە پەیدا بوو. فوقەرای هیند ئەو ئاوازە ناودەنێن (ساراسڤاتی)، و هەموو ئاوازەکان لەو ئاوازە پێکهاتوون.

همه عالم صدای نغمه اوست          که شنید این چنین صدای دراز[٧٠]

ئەو ئاوازە کە نادایە لای یەکتاپەرستانی هیند سێ بەشە:

یەکەم:

"ئاناهاتا"[٧١] واتە ئاوازێك کە هەمیشە بووەو هەیەو دەبێت. سۆفیەکان بەم ئاوازە دەڵێن (ئاوازی ڕەها)و (سوڵتانی زیکرەکان)و ئەبەدی و ئەزەلیەو هەستی (ماهاکاشا) لەمەوەیە. کەس لەم ئاوازانە بەئاگا نابێت مەگەر گەورەکانی هەردوو نەتەوە.

دووەم:

69-Nada

70-هەموو جیهان دەنگی ئاوازی ئەوە، کێ وەها ئاوازێکی درێژی گوێ لێ بووە.

71-Anahata

"ئاهاتە"[٧٢] ئاوازێکە کە لەبەرکەوتنی دوو شت بێ ڕێکسختنی وشە پەیدا دەبێت.

سێهەم:

"شابدا"[٧٣] کە بەهۆی لێکدانی وشەوە پەیدا دەبێت. ئەم ئاوازە بەرابەرە بە ساراسڤاتی و لە هەمان ئەم ئاوازە ناوی گەورە (اسم اعظم) لە نێو ئەهلی ئیسلامدا وای پێ دەڵێن و ئەو وشەیەش کە فوقەرای هیند پێی دەڵێن (ڤیدە موکها) [٧٤] واتە "ئەلف و واوو میم"[٧٥] لەمەوە پەیدابووە.

مانای ئەم ناوە گەورەیەش ئەوەیە کە ئەوە خاوەنی هەر سێ تایبەتمەندیی دروستکردن و هێشتنەوەو لەناوبردن. وە ئەو فەتحە و کەسرە و زەممەی کە پێی دەڵێن "ئاکارا" و "ئوکارا" و "مەکارا" لە هەمان وشە پێکهاتووە. وە ئەم ناوە تایبەتە کە لای یەکتاپەرستانی ئەوان هەیە، تەواو هاوشێوەی ناوی گەورەی ئێمەیە و نیشانەی ڕەگەزی "ئاو" و "ئاگر" و "خاك" و "باو" و "ئاکاشا" و "زاتی پاك"یشە.

---

72-Ahatha
73- Shabda
74-Veda Mukha
75-Aum مەبەست لە وشەی پیرۆزی (ئۆم)ە.

# باسی نوور

نور سێ بەشە، ئەگەر بە سیفەتی جەلال دەرکەوێت یان بە ڕەنگ خۆرە یان بە رەنگی یاقووت یان بە رەنگی ئاگر. وە ئەگەر بە سیفەتی "جەمال" دەرکەوێت یان بە ڕەنگی مانگە یان بە ڕەنگی زیو یان بە ڕەنگی مرواری یان ئاوە. وە نوری زات کە پاکە لە سیفەت بێجگە لە ئەولیاکانی خودا کەسێکی تر لێی تێناگات، ئەو ئەولیایانەی کە دەربارەیان فەرمویەتی:"یهدی الله بنوره من یشاء" واتە "رێنمای هەرکەسێك دەکات بۆ لای نوری خۆی کە خۆی بیەوێت". وە ئەو نورێکە کە ئەگەر کەسێك چاوی بچێتە خەو یاخود بە چاوی داخراوەوە دابنیشێت، نە بە چاو دەیبینێت و نە بە گوێ دەیبیستێت و نە بە زمان باسی دەکرێت و نە بە لوت بۆنی دەکرێت و نە بە دەست هەستی پێدەکرێت. لە خەودا هەموو ئەم شتانە بەیەك شت دەکات و پێویستی بە ئەندام و هەستە دەرەکیەکان و ڕووناکی چرا نیەو دەبنە یەك زات و پێی دەڵێن نوری زات، ئەو نورەش خودایە.

ئەی دۆست بیری لێبکەرەوە کە چیم وت، چونکە جێگەی لێکدانەوەو بیرلێکردنەوەیە. پێغەمبەری خودا (د.خ) لە پێناسەی ئەم

بیرکردنەوەیەدا وتویەتی "تفکر الساعه خیر مــن عمــل ثقلین"، واتــە "بیرکردنــەوەی کاتــژمێرێك و ســەقاڵبون پێیــەوە باشــترە لــە هــەموو کردارەکانی مرۆڤ و فریشتە".

وە ئەو روناکیەی کە بە ئایــەتی پــیرۆزی (الله نــور الــسموات والارض) دەردەکەوێت. دانایانی هیند پێ دەڵێن "جیوتهی سڤاروپا"[76] و "سـڤا پراکشا"[77] و "سڤاپناپراکشا"[78]. واتە ئەم روناکیە هەمیشە خۆیــەخۆو رۆشنە، جا ئەگەر جیهانی تیا دەرکەوێت یان دەرنەکەوێت. بەو شێوەیە کە سۆفیەکان نوور بە ڕوناکی لێــك نادەنــەوە، ئــەوانیش بــەو شــێوەیە لێکیان نەداوەتەوە. وە وەرگێڕانی ئەم ئایەتە پیرۆزە وەهایە:

<u>الله نور السموات والارض</u>: خودای گەورە نوری ئاسمانەکان و زەویە.

<u>مثل نوره کمشکواة فیها مصباح</u>: نوری ئەو وەکو تاقێکە کە چرایەکی تێدا بێت.

<u>المصباح في الزجاجه</u>: ئەو چرایە لە شوشەیەکدا بێت.

<u>والزجاجــة کانهــا کوکــب دري</u>: وە شوشــەکە دەڵێــی ئەســتێرەیەکی گەشاوەیە.

<u>یوقد من شجرة مبارکة لا شرقیة و لا غربیة</u>: داگیرســاوە بــە درەختــی موبارەکی زەیتونێك کە نە ڕۆژهەلاتیە و نە رۆژئاوایی.

---

76- Jyothi Svarupa
77-Svapraksha
78-Svapnapraksha

يكاد زيتها يضي ولو لم تمسسها النار: خەریکە ڕۆنی ئەو زەیتوونە پیرۆزە بسوتێت لە کاتێکدا کە ئاگری لێ نەدراوە.

نور على نور: نورە لەسەر نور.

يهدي الله بنوره من يشاء : خودا ڕێنمایی هەرکەسێك دەکات کە بیەوێت بۆ لای نوری خۆی.

بەڵام ئەوەی بەندە تێی گەیشتوە "مشكواة" کە تاقە جیهانی لەشەکانە و مەبەستیش لە "مصباح" لە چرایە کە نوری زاتە و درەوشاوەیە لە ڕۆشنایی ئەم چرایە، شوشەکەش وەکو چرا وایە.

مەبەست لە شووشە، ڕۆح و ئەو شوشەیەش کە ڕۆحە، وەکو ئەستێرە وایە، وە ئەو چرایەش کە نووری وجودە داگیرساوە بە درەختی پیرۆزی زات کە بێ-بەریە لە ڕووکار، نە ڕۆژهەڵاتیە و نە ڕۆژئاوایی. وە مەبەست لە زەیت ڕۆحی گەورەیە، واتە زاتێکە لەبەر پاکی خۆبەخۆ ڕووناکە و پێویستی بە داگیرسان نیە . وە مامۆستای یەکتاپەرستان "ئەبوبەکری واسطی" لە پێناسەی ڕۆحدا دەفەرموێت: "شوشەی ڕۆحە بە پلەیەك ڕوناکە کە پێویستی بە (دەستلێدان بە زەیتون و بیستنی کتێب نیە و لە ڕووی توانای زاتیی خۆیەوە نزیکە خۆبەخۆ بدرەوشێتەوەو ئەم نوری زەیتە لەگەڵ نور (نور على نور)ە ". واتە لەوپەری پاکی و ڕووناکاییەوە نورە لەسەر نور. وە بەم هەموو نورەوە

لەسەر نور کەس ئەو نابینێ تا خۆی رێنمـایی نـەکات بـۆ سـەر نـوری خۆی.

مەبەست لە کۆی ئەم ئایەتە ئەوەیە کە خودای گەورە بە رووناکی زاتـی خۆی لەپەردە تیوارە نورانیەکاندا دەرکەوتوە و هیچ تاریکی و روپۆشێك لەنێودا نیە. وە نوری زات لە پەردەی "روح الارواح" دا دەرکەوتووە. وە "ڕۆحی ڕۆحەکان" لە پـەردەی "ڕۆحەکانـدا" و رۆحـەکان لـە پـەردەی لەشەکاندا دەرکەوتوون. هـەروەکو چـۆن چـرا بـەو زەیتـە لـە پـەردەی شوشەدا دەرکەوتووە و شوشەش لە پەردەی تاقدا. وە ئەمانەش لە بۆری زات ڕووناکیان بۆ ڕووناکی یاد کردووە.

# باسی بینین

یەکتاپەرستانی هیند بە بینینی خودا دەڵێن (سەتشاتکارا)[٧٩] واتە بینینی خودای گەورە بە چاوی سەر.

بزانە کە هیچ کام لە پێغەمبەرانو ئەولیای کامڵ (نهێنیان پیرۆز بێت) هیچ گومانو جیاوازیەکیان نیە لەسەر بینینی خودای گەورە لە دونیاو رۆژی دواییدا بە چاوی دەرەکیو ناوەکی، وە هەموو ئەهلی کتێبو کامڵەکانو بینایانی هەر نەتەوەیەك بڕوایان بەم شتە هەیە. چ ئەهلی قورئانو چ ئەهلی ڤیداو چ ئەهلی تەوراتو ئینجیلو زەبوور.

ئەوە تێنەگشتنو کەمو کورتیەکانی ئوممەتن کە ئینکاری بینین ئەکەن و ئەگەر زاتی پیرۆز (خودا) بە توانا بێت بەسەر هەموو شتێکدا، چۆن ناتوانێ خۆی دەربخات.

زانایانی ئەهلی سونەو جەماعەت بە باشی پەییان بەم مەسەلەیە بردووە، بەڵام ئەگەر وتیان زاتی پاك دەبینرێ ئەوە مەحاڵە، چونکە زاتی پاك ڕوتو تیوار و بێ پێناسەیە و دیاری ناکرێتو لە پەردەی ناسکیدا دەرناکەوێتو ناتوانرێ ئەو خودایە ببینرێتو وەها بینینێك مەحاڵە.

---

79- Satshatkara

وه ئەوەش کە وتویانە لە دونیادا ناتوانرێ ببینرێ بەلاّم لە رۆژی فەسلاّن دەتوانرێت ببینرێ، ئەوەش ڕاست نیە، چونکە هەموو کات تەواوی هێزی هەیە، کەواتە بە هەر دەرکەوتنێكو هەر کاتێكو لە هەر شوێنێك دەتوانێت دەربکەوێتو هەرکەس لێرە نەیبینێ زەحمەتە بتوانێ لەوێ بیبینێت، وەکو چۆن لە ئایەتێکی پیرۆزدا فەرمویەتی: (و من کان فی هذه اعمی فهو فی الاخرة اعمی) واتە: "هەرکەسێك لە دونیادا لە دیداری من مەحروم بێت، کەواتە ئەو کەسە لە ئاخیرەتیشدا لە نیعمەتی جوانی من مەحروم دەبێت".

وه ئەوانەی ئینکاری بینین ئەکەن کە حوکەماو موعتەزیلەو شیعەن، لەم بارەیەوە هەڵەیەکی گەورە دەکەن. چونکە ئەگەر دەڵێن بینینی زاتی پاك مەحاڵە، خۆ ڕوخسارێکی هەیە. چونکە بڕوایان بە بینینی بەشەکانیشی نیە هەڵەیەکی گەورەتر ئەکەن. زۆرینەی پێغەمبەرانی نێردراوو ئەولیاکان خودایان بە چاوی سەر بینیوەو وتەی ئەویان بێ هۆکار بیستووە. ئەگەر بیستنی وشەیان لە هەموو ڕوکارەکانەوە پێ قوبوڵە، بۆچی پێیان وا نیە کە لە هەموو شوێنێك دەبینرێت.

هەروەکو چۆن بڕوابوون بە خوداو فریشتەو کتێبەکانو پێغەمبەرانو رۆژی دوایی‌و قەزاو قەدەرو خێرو شەڕ بۆ خواو زیارەتی ماڵە پیرۆزەکان فەرزە، بڕوابوون بە بینینی خوداش ئاوا فەرزە.

ئەو ناکۆکیەی کە زانایانی ئـەهلی سـوننەو جەماعـەت هەیانـە لـە مانـاو واژەی ئـەم فەرمودەیەدایـە کـە پێغەمبـەری خـوا لـە وەلاّمـی عائیشەدا کاتێك لێی پرسیوە "هل رایـت ربـك" واتـە خـودای خۆتـت دیوە؟ دەفەرموێت: "نورانی اراه" واتە نورێکە دەیبیـنم. ئـەوان ئـەو فەرمودەیەیان بە "نورانی اره" واتە روناکیە چۆن بیبینم لێك داوەتەوە. بەلاّم ئەمە بەڵگەی ئەوە نیە پێغەمبەر نەیبینیبێت.

ئەگەر مانای یەکەم وەر بگرین ئاماژەیە بۆ بینینی خـودا لـە پـەردەی نوردا. ئەگەریش بەو شێوەیە بیخوێنینەوە کە "نورێکە چـۆن بیبیـنم"، ئاماژەیە بۆ زاتی پاكو بێگەرد، ئەم ناکۆکیـە واژەگـەلیی نیـە بـەڵکو پـەرجوی پێغەمبـەرە کـە لـە یـەك فـەرموودەدا دوو مەسـەلە ڕوون دەکاتەوە.

وە ئایەتی پیرۆزی (وجوه یومئذ ناضرة، الی ربها ناضـرة) واتە "لـەو رۆژەدا کـە ڕوخـسارەکان تـەڕو تـازە دەبنـەوەو لـە رووی پـەروەردگار رادەمێنن". ئەمە بەڵگەیەکی ئاشکرایە بۆ "بینین" چونکە ئەم بینینـە پەیوەسـتە بـە وشـەی ((رب)) پـەروەردگارەوە کـە لـە دیـاریکرنی پەروەردگار بێت دەتوانرێ ببینرێ.

(لاتدرکه الابصار و هو یدرك الابصار و هو لطیف الخبیر)، ئاماژەی بێ ڕەنگیە واتە چاوەکان لە قۆناغی رەهایی و بێ ڕەنگیدا نـایبینن و ئـەو

هەموان دەبینێت‌و لەوپەری تیواری و بێ ڕەنگیدایە، وە لەم ئایەتەدا کە وشەی (هو) هاتووە ئاماژەیە بە نەبینینی زاتی پاك.

بینینی خودای گەورە پێنج بەشە:

١. بینین لە خەودا بە چاوی دڵ.

٢. لە بێداریدا بە چاوی سەر.

٣. لە نێوان خەو و بێداریدا کە بێ خودیەکی تایبەتە.

٤. بینین لە شێوازێکی تایبەتدا.

٥. بینینی یەك زاتی تاك‌و تەنها لە پارچەو پێناسەو جیهانی دەرەکی‌و ناوەکیدا. پێغەمبەر (د.خ) وەهای بینی، کاتێك کە خۆی نەبوو وە لە نێوان بینەر و بینراودا یەك بوو، خەو و بێداری و بێخودی ئەو یەکێك بوو، وە چاوی ناوەکی و دەرەکی ببووە یەك‌و قۆناغی بینینی تەواویش ئەمەیە. بۆ ئەم بینینە دونیاو ئاخیرەت بوونی نیەو هەموو کاتێکو لە هەموو شوێنێك ئامادەیە.

# باسی ناوەكان

ناوەكانی خوای گەورە بێ كۆتاییەو لە ئەندازە بەدەرە. زاتی ڕەهاو پاكو نادیارو حەزرەتی بوون بە زمانی دانایانی هیند (ئاسانگا)[٨٠]و "تری گۆنا" و "نیرانكارا"[٨١] و "نیرانجانا"[٨٢] و "سات"[٨٣] و "چید" و "ئاناندا"[٨٤] ی پێ دەڵێن. ئەگەر زانین بدەنە پاڵی كە موسڵمانەكان پێی دەڵێن"علیم" فوقەرای هیند پێی دەڵێن "چیتەنا" و ناوی "حی" بە "ئانانتا"[٨٥]و بە توانا "قادر" بە "سامارتا"[٨٦] و موریدیان بە "سڤانتا"[٨٧]و بیسەر (سمیع) یان بە "شروتا"[٨٨] و بینەر (بصیر)یان بە "دراشتا"[٨٩] ناو بردووە.

ئەگەر وشە بدەنە پاڵی بە "ڤاكتا"[٩٠] ناوی دەبەن و "الله" بە "ئۆم"و "هو" بە "ساه"[٩١] ناو دەبن.

80-Asangha
81-Nirankara
82-Niranjana
83-Sat
84-Ananda
85-Anantha
86-Samartha
87-Svantha
88- Shruta
89-Drashtha
90-Vakta
91-Soh

فریشتە بە زمانی ئەوان (دێڤاتا)[٩٢]یەو شکڵی ئەتۆم بە "ئاڤەتار"[٩٣] ناو دەبەن. ئاڤەتار ئەوەیە کە هێزی ئیلاهی وەها لەو کەسەدا دەربکەوێت کە لە هیچ کەسێکی تر لە جۆری ئەو دەرنەکەوتبێت لەو کاتەدا. وە بە وەحی دەڵێن "ئاکاشاڤانی"[٩٤]، لەو ڕووەوە وای پێدەڵێن کە پێغەمبەر فەرمویەتی "قورسترین کاتەکان لەسەر من کاتی وەحیە کە بیستم کە وەکو دەنگی زەنگ یان هەنگە"، لەبەرئەوەی دەنگی ئاکاشا دەردەکەوێت پێی دەڵێن "ئاکاشاڤانی".

بە کتێبی ئاسمانی دەڵێن "ڤێدا"و بە جنۆکە باشەکان کە پەرین دەڵێن "ئاپساراس"[٩٥] و بە "دایتیەکان"[٩٦]و ئەوانەی دێوو شەیتان دەڵێن "ڕاکشاسا"[٩٧]. بە مرۆڤ دەڵێن "مانوسیا"[٩٨] و بە وەلی دەڵێن "ڕیشی"[٩٩] و بە پێغەمبەر دەڵێن "ماهاشودها"[١٠٠].

92-Devata
93-Avatar
94- Akashavani
95-Apsaras
96- Daityias
97-Rakshasah
98-Manusya
99-Rishi
100-Mahashudha

# باسی نێردراو و وەلیەکان

پێغەمبەران سێ بەشن :

یەکێك ئەوانەن کە خودایان بینیوە، یان بە چاوی سەر یان بە چاوی ناوەکی.

یەکێکی تر ئەوەیە کە دەنگی خودای گوێ لێ بووە، یان دەنگی پاك و یان دەنگی پێکهاتوو لە وشە.

ئەوی تریش ئەوەیە کە فریشتەی بینیووە یان دەنگی فریشتەی گوێ لێ بووە.

وە پێغەمبەرایەتی و ویلایەتیش سێ بەشە:

یەکێکیان پێغەمبەرایەتی و ویلایەتی (تنزیهی)[١٠١] و ئەوی تر پێغەمبەرایەتیو ویلایەتی (تەشبیهی)[١٠٢] و ئەوی تر پێغەمبەرایەتی و ویلایەتی کۆی تەشبیه و تەنزیە (جامع التشبیه والتنزیه).

---

101- پێغەمبەرێتی و ویلایەتی تەنزیهی ئەوەیە کە ئەو پێغەمبەرە یان ئەو وەلیە خودای تاقانەو زاتی پاکی ئەو بێ هیچ سیفەت و تایبەتمەندی و وەسفێك بپەرستێت. ئەوان پێیان وایە هیچ نمونەیەك نیە لە دونیای ناسوتدا کە وەسفی خودای پێ بکەیت، چونکە وەسفەکان بەچاو خوداوە هیچ نین و خودا لەهەموو ئەو وەسفانە هەرچەند رەهابن گەورەترە.

پێغەمبەرایەتی (تنزیهی) وەکو پێغەمبەرایەتی نوحە سلاّوی خوای لێبێت کە خودای بە پاکی بینی و بانگهێشتی خەڵکی دەکرد و ئوممەت لەبەر پاکی خودا لە سیفەت، بڕوایان پێی نەهێناو کەمێك نەبێت‌و هەموو لە بەحردا لەناو چوون.,

ویلایەتی پاکیش وەکو ئەو زاهیدانەی کە موریدەکانیان بۆ پاکیی خودا بانگ دەکەن‌و پێیان دەوترێت ویلایەتی (تەنزیهی)، هیچ کام لە موریدەکانیان نابنە داناو سود لە وتەکانیان وەرناگیرێت‌و لە رێگەی سلوك‌و تەریقەتدا لەناو دەچن.

وە پێغەمبەرایەتی (تشبیهی) وەکو پێغەمبەرایەتیەکەی موسا (سلاّوی خودای لێ بێت) کە خۆی خودای لە ئاگرو درەختدا بینی‌و قسەی لێ بیست. وە زۆرینەی ئوممەتەکەی لە لاساییکردنەوەی موسا کەوتنە هەڵەوەو بوونە گوێرەکە پەرست‌و سەرپێچی خودایان کردو ئەمڕۆش هەندێ لە لاساییکەرەوەکانی سەردەمی ئێمە، یان ئەوانەی کە تەنها لاسایی پێگەیشتوان (کاملاّن) دەکەنەوە لەسەر ئەوە دەژین و لە (تنزیە) دوور کەوتوونەتەوەو کەوتوونەتە لاساییکردنەوەی (تشبیە)

---

102- ویلایەت و پێغەمبەرایەتی تەشبیهی ئەوەیە کە ئەو پێغەمبەر و وەلیە بۆ تێگەیاندنی خەڵکی لە خودا باس لە سیفەت و تایبەتمەندیەکانی خودا بکەن بە پێی یاساو رێساکانی جیهانی ناسوت بۆ نمونە وەکو ئەوەی بڵێن خودا بینەر، خودا بیسەرە، خودا دانایە.

دەوەو گرفتاری وێنەی جوان و دڵڕفێن و یاری و گەمە بوون و نابێت پەیڕەویان لێ بکرێت.

**هر صورت دلکش که تو را رویی نمود**

**خواهد فلك از چشم تواش زود ربود**

**رود دل به کسی ده که در اگوار وجود**

**بوده‌است همیشه تا بود خواهد بود**

ئەوی تر پێغەمبەرایەتی کۆی پاکی وێنە (جمع التنزیه و التشبیه) واتە کۆکەرەوە "بێ تایبەتمەندی و تایبەتمەندیە" و "ڕەهاو پەیوەست" و "بێ ڕەنگ و بەڕەنگ"ی کۆکردۆتەوەو ئەم ئایەتە پیرۆزەش هێمایە بۆ ئەو قۆناغە:

**(لیس کمثله شیء وهو سمیع البصیر).**

واتە: "لەشێوەی ئەو نیە و هەروەها ئەو بیسەر و بینەریشە". ئەمە[١٠٣] ئاماژەیە بە پایەی تەنزیە و بینەرو بیسەریش ئاماژەیە بە مەقامی تەشبیە. ئەمەش پایەی بەرزی هەمەگیرو کۆتایە کە تایبەتە بە زاتی گەورەوە (مەبەست **محمدە** "د.خ") هەموو جیهانی لە رۆژهەلات و رۆژئاواوە داپۆشیوەو پێغەمبەرێتی تەنزیهی و بەتاڵە لە پێغەمبەرێتی تەشبیهی و پێغەمبەرێتی تەشبیهی بەتاڵە لە پێغەمبەرێتی تەنزیهی و هەمەگیری هەردووکیشیانە. وەکو **(هوالاول الاخر والظاهر والباطن).**

103-(ئەمە) واتە: کەس لە وێنەی ئەو نیە.

وه ئەم ویلایەتی تایبەته به پێگەیشتوانی ئەم ئوممەته که خودای گەوره له وەسفیاندا فەرموویەتی: (کنتم خیر امة اخرجت للناس) واته: "باشترین ئوممەت ئەوانەن که کۆکەرەوەی تەشبیهو تەنزیهن". هەروەکو له سەردەمی پێغەمبەردا (د.خ)و له ئەولیاکاندا ئەبوبەکرو عومەرو عوسمانو عەلیو حەسەنو حسەینو نۆ کەسایەتیەکه (تسعة باقیة)و ده مژدەپێدراوەکه (عشرة مبشرة)و گەورەکانی کۆچکردوو پشتیوان (مهاجر و انصار) و ئەهلی صەفا.

له تابعین وەکو ئەوسی قەرەنی و نمونەی ئەو، وه له سەردەمی دواتردا وەکو زوننونی میسری و فوزەیلی عەیازو مەعروفی کەرخیو ئیبراهیمی ئەدهەم و بوشری حافی و سری سەقتیو بایەزیدی بەستامیو ئەبوقاسمی جونەیدو سەهلی کوری عەبدولاّ تەستوری و ئەبو سەعیدی خەرپازو رویەمو ئەبولحسەینی نوریو ئیبراهیم خەواسو ئەبوبەکری شبلیو ئەبوبەکری واستیو نمونەی تری وەکو ئەوان.

وه له دواتردا وەکو ئەبو سەعیدی ئەبولخەیر، شێخولئیسلام و خواجه عەبدولاّی ئەنساری و شێخ ئەحمەد جامیو محەمەد مەعشوقی توسی و ئەحمەد عەرپابی و ئەبولقاسمی گورکانی.

له سەردەمی دواتریشدا وەکو پیری من شێخ محێدین عەبدولقادر گەیلانی و شێخ ئەبو مەدیەنی مەغریبی و شێخ محێدین ئیبن عەرەبی و

شێخ نەجمەدینی كوبراو شێخ فەریدەدین عەتارو مەولانا جەلالەدینی رۆمی،[١٠٤]

وە لە سەردەمی دواتردا وەك خواجە موعینەدینی چەشتی و خواجە بەهائەدینی نەقشبەندیو خواجە ئەحرارو مەولانا عەبدولرەحمان جامیو لە سەردەمی ئێمەشدا وەكو شێخ جونەیدی دووەم و شاە میر و مامۆستاكەم میان باری و مورشیدەكەم مەلا شاهو شا محەمەد دلڕوباو میان لال (بابا لال داس).

104- لە هەندێ سەرچاوەدا ناوی حەزرەتی خواجە حافزی شیرازیشی داناوە.

# باسی بڕەهماندە[105]

مەبەست لە بڕەهماندە هەموو پەیوەستبوون و دەرکەوتەکانی حەزرەتی بوونە کە بە شێوەی کەرەی خڕە. لەبەرئەوەی بۆ هیچ لایەك حەزو پەیوەستبوونی نیە و لەبەرامبەر هەمووواندا یەکسانەو هەموو پەیدابوون و نمایشێك لەودایە. هەربۆیە یەکتاپەرستانی هیند پێی دەڵێن "بڕەهماندە"[106].

105-ئەم باسەی داراشکۆ زۆر سادە بەڵام لەهەمانکاتدا زۆر ئاڵۆزە و هیچ ڕوون نیە کە داراشکۆ مەبەستی چی بووە وا بەو شێوەیە و بەو کورتیە لەسەر ئەم باسە دەوەستێت و نایەوێت زیاتری لێ باس بکات. نەك هەر ئەم باسە بەڵکو باسی دواتریش کە مەسەلەی ڕووکارەکانی بوونە دەکرا زۆر قوڵتر و زیاتر باسی بکردایە، بەڵام بەوپەڕی سادەییەوە لێی دواوە کە ناکرێت بڵێین داراشکۆ هیچی لەبارەی ئەم دوو مەسەلەیەوە نەزانیوە.

106-Brahmanda

# باسی ڕوکار

یەکتاپەرستانی ئیسلام هەر یەك لە رۆژهەلاتو رۆژئاوا و باکورو باشورو سەرەوەو خوارەوە بە ڕوکاری باوەرپێکراو دەزانن و پێی دەڵێن شەش ڕوکارەکە. وە یەکتاپەرستانی هیند پێی دەڵێن دە ڕووکارەکە، واتە نێوانی رۆژهەلات و رۆژئاوا و باکور و باشوریش بە ڕوکاری باوەڕپێکراو دەزانن و پێی دەڵێن (داسادێشا) [107] واتە دە ڕوکارەکە. [108]

---

107-Dasadesha

108- لەبەر کورتی باسەکەی داراشکۆ حەزم کرد ئەم کەمە زانیاریە بخەمە سەر بابەتەکە: لە بیروڕای هیندۆیزمدا ڕووکارەکان لەمانە پێکدێن و هەر رووکارێك فریشتەیەك پاسەوانی دەکات.

لە باکور کوبێرا (Kubera) نیشتەجێیە کە فریشتەی سەروەت و سامانە.

باشور یاما نیشتەجێیە کە فریشتەی مردنە.

لە ڕۆژئاوا ئادیتیا نیشتەجێیە کە فریشتەی ڕوناکی خۆرە.

لە ڕۆژهەلات ڤارونا نیشتەجێیە کە فریشتەی بارانە.

لە باکوری ڕۆژئاوا ڤایو نیشتەجێیە کە فریشتەی هەوایە.

لە باکوری ڕۆژهەلات ئیشڤاڕاشیڤا نیشتەجێیە کە یەکێکە لە خودایانی تری مورتی.

لە باشوری ڕۆژئاوا پیترو نیشتەجێیە.

لە باشوری ڕۆژهەلات ئاگنی نیشتەجێیە کە فریشتەی ئاگرە.

# باسی ئاسمان

ئاسمان کە پێی دەڵێن "گاگانا"[١٠٩] بە پێی ئەهلی هیند هەشتە، حەوتی مەڵبەندی حەوت هەسارەکەیە کە زوحەل و موشتەری و مەریخ و خۆر و زوهرە و عەتارد و مانگن. بە زمانی ئەهلی هیند بەم حەوت هەسارەیە دەڵێن (ناکشاترا)[١١٠] واتە شانایشچارا[١١١]، بریهاسپاتی[١١٢]، مانگالا[١١٣]، سوریا[١١٤]، شوکرا[١١٥]، بودا[١١٦] و چاندراماس[١١٧]. وە ئاسمان کە شوێنی هەسارە وەستاوەکانە بە هەشتەم دەزانن، وە دانایان هەمان ئاسمان بە فەلەکی هەشتەم و فەلەکی جێگیر ناو دەبەن کە بە زمانی ئەهلی شەرع "کورسی"ە.

(وسع کرسیه سموات والارض) واتە: "ئاسمانەکان و زەوی لە کورسیدان". وە نۆیەم کە ئەوان بە "ماهاکاشا"ی ناودەبەن، نەیانخستوەتە ناو ئاسمانەکانەوە لەبەرئەوەی کە دەوری هەموانی داوەو دەوری کورسی و زەوی و ئاسمانەکانی داوە.

---

لە سەرەوە سەری برەهما نیشتەجێیە.

لە خوارەوە قاچەکانی برەهما نیشتەجێن.

109-Gagana
110-Nakshatra
111-Shanaishchara
112-Brihaspasti
113-Mangalam
114-Surya
115-Shukra
116-Buddha
117-Chandramas

# باسی زەوی

زەوی لە لای ئەهلی هیند حەوت چینە کە پێی دەڵێن "ساپتا پاتالا"[١١٨]. وە هەر چینێکی ناوێکی هەیە : ئاتالا[١١٩]، ڤیتالا[١٢٠]، سوتالا[١٢١]، تاتالا[١٢٢]، ماهاتالا[١٢٣]، ڕاساتالا[١٢٤]، پاتالا[١٢٥]. بە پێی ئەهلی ئیسلامیش حەوت چینە بە پێی ئایەتی پیرۆزی (**الله الذی خلق بع السموات و من الارض مثلهن**)، واتە: "خودای گەورە ئەو خودایەی کە حەوت ئاسمانەکەی دروست کردووە و زەویش بەهەمان شێوە".

---

**118- Sapta patala**
**119-Atala**
**120-Vitala**
**121 -Sutala**
**122- Tatala**
**123- Mahatala**
**124- Rasatala**
**125- Patala**

# باسی بەشەکانی زەوی

دانایان یەك لەسەر سێی نەجولاّویان کردووە بەحەوت بەشەوەو پێی دەڵێن"حەوت هەرێمەکە"، وە ئەهلی هیند پێی دەڵێن "ساپتا دڤیپا"[١٢٦]. ئەم حەوت چینەی زەوی وەکو پێستی پیاز لەسەریەکتر نین، بەڵکو بە قۆناغ وەکو پایەگەل و کۆڵەکە دەیانبینن و بەرچاو دەکەون و پێیان دەڵێن :

١. جامبودڤیپا (Jambu Dvipa).
٢. پالاکشادڤیپا (Palaksha Dvipa).
٣. کۆشا دڤیپا (Kosha Dvipa).
٤. شوکتی-مات دڤیپا (Shukti mat Dvipa).
٥. شالمالی دڤیپا (Shalmaly Dvipa).
٦. کرۆمچە دڤیپا (Kromcha Dvipa).
٧. پوشکارا دڤیپا (Pushkara Dvipa).

وە بە حەوت کێوەکە دەڵێن "ساپتا کولاچالا"وە پێیان وایە کە بە دەوری هەر زەویەکدا کێوێك هەیە و ناوەکانیان ئەمەیە:

---

126-Sapta Dvipa

١. سومیرۆ Sumeru.
٢. سامۆپات Samupath.
٣. هەمکوت Hamkut.
٤. هیماڤات Himavat.
٥. نیشادا Nishada.
٦. پاریاترا Paryatra.
٧. کایلاس Kailas.

هەروەکو چۆن لە ئایەتی پیرۆزدا هاتووە: (وجعلنا الجبال اوتـادا) واتـە شاخەکانمان کردووە بە میّخی زەوی. وە بە دەوری هەریەکێك لەو حەوت کێوەدا حەوت دەریا هەن کە دەوری هەر کێوێك دەدەن و پێیـان دەڵـێن "ساپتا سامودرا"، وەناوەکانی ئەم حەوت سامودرایە ئەمانەیە:

١. لاڤانا[١٢٧]. واتە دەریای ئاوی سوێر.
٢. ئیکشوراسا[١٢٨]. واتە دەریای ئاوی قامیشی شەکر.
٣. سورا[١٢٩]. واتە دەریای شەراب.
٤. گرتا[١٣٠]. واتە دەریای رۆنی زەرد.
٥. دەهی[١٣١]. واتە دەریای ماست.

127-Lavana
128-Ekshorasa
129-Sura
130-Grta

٦. دوگدا[١٣٢]. دەریای شیر.

٧. سڤادوجا[١٣٣]. دەریای ئاوی شیرین.

وە بوونی دەریاکان بە حەوت ژمارە لەم ئایەتە پیرۆزەوە مەعلوم دەبێت: (ولوا انما فی الارض من شجرة اقلام و البحر یمده من بعده سبعة ابحر ما نفذت کلمات الله) واتە: "بەراستی ئەگەر درەختەکان کەلەسەر زەوین ببنە قەلەم و دەریاکان ببنە مورەکەب و پاشان حەوت بەحرەکەش ڕەش ببن ئەوا وشەکانی خوای گەورە تەواو نابن".

وە لە هەر زەوی و کێووو دەریایەکی بەشکراودا بەدیهێنراو هەن. وە ئەو زەوی و کێوو دەریایەی کە لە سەرو زەوی‌و کێوو دەریاکانەوەیە، بە پێی لێکۆڵەرانی هیند پێی دەڵێن "سڤارگا" کە بەهەشتە. ئەو زەوی و کێو و دەریایەی کە لە خوار هەموو زەوی و کێو دەریاکانەوەیە پێی دەڵێن "ناراکا"[١٣٤] کە دۆزەخە.

131-Dahi
132-Dugha
133-Svadujha
134-Naraka

وە بە ڕای یەکتاپەرستانی هیند بەهەشت و دۆزەخ لە هەمان ئەو جیهانە بەدەر نیە کە پێی دەڵێن "برەهماندە". [١٣٥]

وە وتراوە ئەم حەوت ئاسمانە کە مەڵبەندی حەوت هەسارەکەن بە دەوری بەهەشتدا دەسوڕێنەوە نەك بەسەر بەهەشتا. وە پێیان وایە سەقفی بەهەشت "ماهاکاشا"یە کە عەرشە و خاکی بەهەشتیش کورسیە.

135- ئەمە پێچەوانەی بیروڕاو فەتوای ئەو کۆلکە مەلاو نەزانانەیە کە پێیان وایە هیندیەکان لەبەرئەوەی بڕوایان بە لەدایکبونەوەی دووبارە هەیە، بڕوایان بە بەهەشت و دۆزەخ نیە.

# باسی جیهانی بەرزەخ

پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی کە: "من مات فقد قام قیامته". واتە هەر کەسێك مرد بە دڵنیاییەوە قیامەتی ئەو هەستاوە.

پاش مردنی ئاتما کە ڕۆحە وە لە لەشی ڕەگەزیی جیابوویەوە، بێ بەشداریکردنی کات دەچێتە لەشی موکت (ئازادی)ەوە کە پێی دەڵێن "سوکشما شریرا"[136]. وە ئەو لەشێکی ناسك و تیوارە کە لە کردەوە دروست بووە، یان لەکرداری باش یان لە کرداری خراپ و بەد. پاش پرسیارو وەڵام بە خێرایی و بێ وەستان ئەهلی بەهەشت بۆ بەهەشت و ئەهلی دۆزەخ بۆ دۆزەخ دەبەن، بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە:

**(فاما الذین شقوا ففی النار لهم فیها زفیر و شهیق، خالدین فیها مادامت السموات والارض الا ما شاء ربك ان ربك فعال لما یرید، واما الذین سعدوا ففی الجنة خالدین فیها مادامت السموات والارض الا ماشاء ربك عطاء غیر مجذوذ ).** واتە: "ئەوانەی بەدبەختن لەئاگردا دەبن و ناڵە و هاواریان بە هەتا هەتایی لەوێ دەبێت تا کاتێك ئاسمان و زەوی هەبێت، مەگەر ئەوەی پەروەردگارت نەیەوێت، بەڕاستی پەروەردگاری

136-Sukshma shrira

تۆ کارایە بە هەر شتێك کە بیەوێت، ئەوانەشی کە خۆشبەختن لە بەهەشتدا دەبن تا ئاسمانەکانو زەوی بمێنن، مەگەر تا کاتێك کە خودای تۆ بیەوێت ئەوان دەر بێنێت، بەخششی ئەو بێ کۆتاییە".

دەرهێنان لە دۆزەخ ئەوەیە کە پێش لەناوچوونی ئاسمانەکانو زەوی ئەگەر دەرهێنرا ئەوا بۆ بەهەشت دەچێت.

ئیبن مەسعود خوای لێ رازی بێت لە لێکدانەوەی ئەم ئایەتەدا دەڵێت: "**لیاتین علی جهنم لیس فیها احد و ذلك بعد ما یلبثون فیها احقابا**". واتە: "کاتێك دێت بەسەر دۆزەخدا کە هیچکام لە دۆزەخیەکان لەوێدا نەمێننەوە دوای ئەوەی کاتێکی زۆر تێیدا بوون". وە دەرهێنانی ئەهلی بەهەشت ئەوەیە کە پێش لەناوبردنی ئاسمانەکان و زەوی ئەگەر خودا بیەوێت ئەوان دەباتە فیردەوسی باڵا، چونکە بەخشینی ناکۆتایە. هەروەها لەم ئایەتە پیرۆزەش جێگیر بووە کە (**رضوان الله اکبر وذلك هو فوز عظیم**). واتە :"خودای گەورە بەهەشتێکی هەیە گەورەتر لە بەهەشتەکان"، کە ئەهلی هیند پێی دەڵێن "ڤایوکنتا"[١٣٧] کە ئەمە رزگاربوونی گەورەیە.

---

137-Vyukunta

# باسی ڕۆژی دوایی ( فەسلاّن )

بە لای یەکتا پەرستانی هیندەوە ڕۆژی دوایی ئەوەیە کە پاش ئەوەی لە بوون لە دۆزەخ و بەهەشت کاتێکی زۆر تێپەڕی "ماها پرا لایـا"[١٣٨] دێت کە بریتیە لە "فەسلاّنی گەورە" کە لەم ئایەتەدا ئاماژەی پێکراوە (فاذا جاءت طامة الکبری) واتە کاتێك فەسلاّنی گەورە هـات. وە لـەم ئایەتەشدا دەردەکەوێت (و نفخ فی الصور فصعیق من فی الـسموات و من فی الارض الا ماشـاء الله). واتە کاتێك فوو بـە صـوردا دەکرێـت هەرچی کە لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە بێهۆش دەبێت، مەگەر کەسێك کە خودا بیەوێت لەبێهۆش بوون بیپارێزێت. ئەو کۆمەڵەش عارفـەکانن کە لە بێهۆشی پارێزراون لە دونیاو فەسلاّندا.

وە پاش لەناوچـوونی ئاسمانـەکانو زەوی‌و فـەنابوونی دۆزەخیـەکانو بەهەشتیەکانو تەواوبوونی تەمەنی "بڕەهما"و نەبوونی "برەهمانـدە"و ئەهلی دۆزەخو بەهەشت "موکتە"[١٣٩] دەکـرێن، واتـە هـەردوو لـەزاتی هەقدا دەتوێنەوەو فانی دەبن.

---

138-Mahapralaya

139-Mukta واتە ئازاد لە ڕەنگ و تایبەتمەندی.

# باسی موکتە

موکتە بریتیە لە توانەوەو لەناوچوونی تایبەتمەندیەکان لـە حـەزرەتی وجوددا کە لەم ئایەتە پیرۆزەدا دەردەکەوێت: (ورضـوان من الله اکـبر و ذلك هو فوز العظیم) واتە ڕزگاربوونی موکتـە چـوونە نـاو ڕازیبـوونی گەورەیە کە فیردەوسی بالاّیە.

موکتە سێ بەشە:

**بەشی یەکەم:**

"جیاڤان موکتە"[١٤٠] ڕزگاربوونی ژیـان. وە جیڤـان موکتـە لای ئـەوان هەرکەس لە ژیاندا بەهۆی عیرفان و ناسـینی هەقـەوە ئـازادو سـەرفراز بێتو لە هەموو جیهاندا هەموو شـتێك بـە یـەك ببینێـت و بـە یـەك بزانێتو کردارو ئیشو جولاّنەوەو چاكو خـراپ بداتـە پـالّ خـۆی نـەك کەسێکی تر. وە خۆی لەگەلّ هەموو شتەکانی دیکەشدا بە هەق بزانێت و لە هەموو قۆناغەکانیدا هەق ڕەنگ بداتەوە. وە هەموو برەهماندە کە سۆفی پێی دەلّێت "جیهانی گەورە"و شێوەی هەمەگیری خودایـە وەکـو

140-Jivan Mukta

لەشی جەستەیی خودایەو، ڕەگەزی گەورەش کە "ئاکاشایە" وەکو "سوکشما شریرا"و لەشی تیوارو هەتاهەتایی خودایەو زاتی خوداش وەکو ڕۆحی ناو لەشی ئەو کەسە بدات لە قەڵەم. وە هەر گەردو هەر ڕەگەزێك لە جیهانی شاراوەو نهێنی بێ ئەوی تاقانەو بێ هاوتا، نەبینێت و نەزانێت. هەروەکو مرۆڤێك کە پێی دەڵێن "جیهانی بچوك" بە جیاوازی ئەندامە جیاوازە زیادبووەکانی "متكثرة"، بەهۆی زۆریی ئەندامەکانیەوە نابێتە زۆر. زاتی یەکیتاش بە هۆی زۆری تایبەتمەندیەکانیەوە بە زۆر ناناسرێت. هەروەکو چۆن "شێخ سەعدەدین حەمەوی" فەرموویەتی:

حق جان جهان است و جهان جمله بدن
ارواح و ملایك حواس این همه تن
افلاك عناصر وموالید اعضاء
توحید همین است و دگرها همه فن"[١٤١]

141-ڕاستی گیانی جیهان و جیهان هەموو لەشە، ڕۆح و فریشتەکان هەستەکانی ئەم لەشەن، فەلەکەکان ڕەگەزەکان و لەدایك بووەکان ئەندامەکانی ئەون، یەکتاپەرستی ئەمەیەو بێجگە لەمە هەمووی هونەر و وشەڕێژەییە.

هەروەها یەکتاپەرستانی هیند وەکو ڤیاسا[142] و ئەوانی دیکـە، هـەموو بە هماندە کە جیهانی گەورەیە وەکو یەك "زات" داویانـە لـە قەلـّەم و ئەندامەکانی لەشی ئەوان بەم شـێوەیە بـاس کـردوە، لـەو ڕووە وە کـە سۆفی لە هەر کاتێکدا سەیری هەر شتێك بکات بزانێت کە نیگـای لـە فلاّنە ئەندامی "ماهاپوروشا" کردووە:

پاتالا کە چینی حەوتەمی زەویە، بنی پێی ماهاپوروشایە.

ڕاساتالا کە چینی شەشەمی زەویە، پشتی پێی ماهاپوروشایە.

شەتانەکان پەنجەکانی قاچی ماهاپوروشان.

گیانەوەرانی سوار پشتی شەیتانەکان، نینۆکەکانی قاچی ماهاپوروشایە.

ماهاتالا کە چینی پێنجەمی زەویە، پاژنەی پێی ماهاپوروشایە.

تاتالا چینی چوارەمی زەوی، ڕانی ماهاپوروشایە.

کالا[143] واتە کات ڕەفتاری ماهاپوروشایە.

ئاتالا چینی یەکەمی زەوی ئەندامی تایبەتی ماهاپوروشایە.

پراجاپاتی دیڤاتا کە هۆی زۆربوونی خەڵکە نیشانەی پیاوەتی و هێـزی پیاوانەی ماهاپوروشایە.

باران سپێرمی ماهاپوروشایە.

بهولۆکا واتە لە زەوی تا ئاسمانی خواروو، ناوکی ماهاپوروشایە.

---

142-Vyasa
143-kala

سێ کێوەکەی بەشی باشوورو سێ کێوەکەی بەشی باکوور، دەستی ڕاست و دەستی چەپی ماهاپورروشایە.

سومیرو دوو سەرینی ماهاپورروشایە.

رووناکی بەرەبەیان کە ڕەنگی سپیە وە ڕوناکی ئێوارە کە ڕەنگی شەفەقی هەیە، پارچەی دەوروبەری عەورەتی ماهاپورروشایە.

سامودرا واتە بەحرو زەریا، ناوکی ماهاپورروشایە.

ڤادا ڤانالا[144] ئاگرێکە کە ئاوی حەوت دەریاکە ڕادەکێشێت و نایهێڵێت بکەوێتە تۆفان و لە فەسڵانی گەورەدا هەموو ئاوەکان وشك دەکاتەوە، ئەوە گەرمی گەدەی ماهاپورروشایە کە بەو گەرمیە هەموو شتێك هەرس دەکات.

دەریاکانی دیکە دەمارە خوێنیەکانی ماهاپورروشان، چونکە هەموو ڕەگەکان دەگەنەوە بە ناوك، هەموو دەریاکانیش دەگەن بە "ساموردا".

گانگا[145] و یامونا[146] و سارا سڤاتی شاڕەگی ماهاپورروشان.

ئایدا[147]، گانگا، پینگا[148]، یامونا، سۆشۆمنا[149]، ساراسڤاتی کە لە سەروو بهورلۆکاوەن وە گاندهاراکان لەوێن و لەوێوە گۆرانی دەوترێت، ورگی ماهاپورروشایە.

---

144-Vadavalanga
145-Ganga
146-Jamuna
147-Ida
148-Pingala
149-Soshomna

ئاگری فەسلاڵنی بچوك، حەزی خواردنی ئێستای ماهاپوروشایە.
وشکبونەوەی ئاوەکان لە فەسلاڵنی بچوکدا، تونیەتی و ئاوخواردنەوەی ماهاپوروشایە.
سڤارگەلۆکا[150] کە لەم سەر بهورلۆکاوەیە و چینێکە لە چینەکانی بەهەشت، سنگی ماهاپوروشایە کە هەمیشە پڕە لە خۆشحاڵیو شادیو ئارامی.
کۆی ئەستێرەکان لە خشڵ و زێڕ و زیوی ماهاپوروشایە.
بەخشینی پێش داواکردن کە کەرەمو فەزڵە، مەمکی ڕاست و بەخشینی پاش داواکردن مەمکی چەپی ماهاپوروشایە.
هاوسەنگی سێ گۆناکە کە راجاگۆنا و ساتڤاگۆنا و تاماگۆنایە و پێیان دەڵێن پراکریتی، دڵی ماهاپوروشایە.
وەکو چۆن کۆڤالا[151] سێ ڕەنگی سپی و سور و وەنەوشی هەیە، دڵیش کە بە شێوەی کۆڤالایە سێ تایبەتمەندی هەیە کە ئەمەش سێ رەنگەکەی بوونە کە برەهما و ڤیشنۆ و ماهیشڤارایە.
برەهما کە ماناسیشی پێ دەوترێت، جوڵەو ویستی دڵی ماهاپوروشایە.
ڤیشنۆ سۆزو بەزەیی ماهاپوروشایە.
ماهیشڤارا توڕەیی و غەزەبی ماهاپوروشایە.

---

150-Svarga loka
151-Kovala

مانگ[152] زەردەخەنەوخۆشحالّی ماهاپوروشایە کە گەرمی ئازارو خەوو دەرەوێنێتەوەو تیروکەوانی دەستی ماهاپوروشایە.
کێوی سومیرۆ ئێسکی ناوەراستی پشتی ماهاپوروشایە.
کێوەکانی دەستی راستو چەپی سومیرۆ، ئێسکە لاوەکیەکانی ماهاپوروشان.
لەناو هەشت لۆکاپالاکەدا، ئیندا[153] کە گەورەیانە و هێزی تەواوی هەیە، بەخشین و بارین و نەبەخشین و نەبارینی پێوە پەیوەستە، هەردوو دەستی ماهاپوروشان. دەستی راست بەخشین و بارین و دەستی چەپ گرتنەوەی بەخشین و بارینی ماهاپوروشایە.
ئابساراکان[154] کە حۆریەکانی بەهەشتن، خەتی دەستی ماهاپوروشایە.
ئەو فریشتانەی پێیان دەوترێت "یاکشا"[155] نینۆکەکانی ماهاپوروشایە.
سێ فریشتەکەی لۆکاپالا، دەستی راستی راستی ماهاپوروشان، کە فریشتەی ئاگنی لە مەچەك تا ئەنیشکە، وە یاما[156] فریشتەی ئەنیشکە و ناریتا[157] فریشتەی بازووە.

152-Chandra
153-Indra یەکێکە لە گەورەترین خواوەندەکانی ناو ڤێدا.
154-Absaras
155-Yaksha
156-Yama
157-Narita

وە سێ فریشتەی تری لۆکاپالا دەستی چەپی ماهاپوروشان، لە مەچەک تا ئەنیشک ئیشانای ناوە، کۆبیرا فریشتەی ئەنیشکی ماهاپوروشایە.
کالپاڤریکشا[١٥٨] کە "طوبا"یە، گۆچانی[١٥٩] دەستی ماهاپوروشایە.
جەمسەری بەستەڵەکی باشوور شانی ڕاست و بەستەڵەکی باکور شانی چەپی ماهاپوروشایە.
ڤارونا کە ناوی فریشتەیەکی لۆکاپایە و بەرپرسی ئاوە لە ڕۆژئاوا، برپڕەی ملی ماهاپوروشایە.
ئاناهاتانادا[١٦٠] کە گەورەی زیکرەکانە، دەنگی ماهاپوروشایە.
ئەو تەماعەی لەجیهاندایە، لێوی خوارەوەی ماهاپوروشایە.
شەرم و حەیا لێوی سەرەوەی ماهاپوروشایە.
سنگ واتە خۆشەویستی و ئولفەتی دونیا، ددانەکانی ماهاپوروشایە.
هەڵچوونی هەموو جیهان خۆراکی ماهاپوروشایە.
ڕەگەزی ئاو مەلاشوو قوڕگی ماهاپوروشایە.
ئاگر زمانی ماهاپوروشایە.
سەرەسڤاتی هێزی وتەی ماهاپوروشایە.
ڤێدا[١٦١] وتەی ماهاپوروشایە.

158-Kalpavrikshah
159-Govani
160-Anahatanada

مایا کە هۆکاری پەیدابوونی جیهانە، بزەو ڕووخۆشی ماهاپوروشایە.
هەشت ڕووکارەکەی جیهان هەردوو گوێی ماهاپوڕوشایە.
"ئاشڤینی کومار" کە دوو فریشتەی زۆر جوانن، هەردوو کونەلوتی ماهاپوڕوشایە.
"گاندهاتانماترا"[١٦٢] واتە ڕەگەزی خاك، هێزی بۆنی ماهاپوڕوشایە.
نێوان جانالۆکا و تاپۆلۆکا کە چینی پێنجەم و شەشەمی بەهەشتە و پڕە لە نوور، نیوەی باشووری ئاوی ڕاست و نیوەی باکووری چاوی چەپی ماهاپوڕوشایە.
سەرچاوەی ڕوناکی کە خۆری ئەزەلی پێ دەڵێن هێزی بینینی ماهاپوڕوشایە.
تەواوی بوونەوەری جیهان نیگای نەرمی ماهاپوڕوشایە.
ڕۆژو شەو چاو تروکاندنی ماهاپوڕوشایە.
"میترا"[١٦٣] ناوی ئەو فریشتەیەی کە بەرپرسی هاوڕێیەتی و خۆشەویستیەو "توشتا"[١٦٤] ناوی ئەو فریشتەیەی کە بەرپرسی تورەبوون و غەریزەیە، هەردوو برۆی ماهاپوڕوشایە.

---

161-پاش چاوپرینە دەسەڵات لە لایەن براکەیەوە یەکێك لەو هۆکارانەی کە براکەی دارا شکۆ بە دەستیەوە بوو بۆ ئەوەی دارا بکوژێت ئەوە بوو کە دەیوت داراشکۆ دەڵێت ڤیدا کتێبی خودایەو ئەمەش قسە هەڵبەستنە بەدەم خوداوەو تەنها قورئان کتێبی ئاسمانیە.
162-Gandha tanmatra

تاپالۆکا[١٦٥] کە بەرزترە لە جانالۆکا، ناوچەوانی ماهاپوڕوشایە.

ساتکۆلۆکا[١٦٦] کە بەرزترە لە هەموو لۆکاکان کاسەی سەری ماهاپوڕوشایە.

ئایەتەکانی تەوحیدی نێو کتێبی خودا مێشکی ماهاپوڕوشایە.

هەوری ڕەش کە بارانی "ماهاپرالا"ی پێیە، مووی سەری ماهاپوڕوشایە.

سەوزیەکانی هەموو لۆکاکان مووەکانی لەشی ماهاپوڕوشایە.

لاکشمی کە سامانی باشی جیهانە، جوانی ماهاپوڕوشایە.

خۆری گەشاوە تایبەتمەندیەکانی لەشی ماهاپوڕوشایە.

بهوتاکاشا کونە مووکانی لەشی ماهاپوڕوشایە.

چیداکاشا ڕۆحی ئەم لەشەی ماهاپوڕوشایە.

لەشی هەر تاکێکی مرۆڤ ماڵی ماهاپوڕوشایە.

مرۆڤی کامڵ خەڵوەتگەدەی ماهاپوڕوشایە. وەکو لە فەرموودەکەی داود (علیە سلام) هاتووە: "ئەی داود خانویەکم بۆ دروست بکە، داود وتی: خودایا تۆ پاکی و بێ بەریت لە ماڵ، خودا فەرمووی: ماڵی من تۆی، دڵ لە خەڵك بەتاڵ بکەرەوە".

---

163-Mitra
164-Tushta
165-Tapa Loka
166-Mahashudha

هەرچی لە برەهماندەدایە شایستەی لێکدانەوەیە لە مرۆڤدا کە کۆپی جیهانی گەورەیە بەکۆی هەموو بوونەوەرەکان.

بەشی یەکەم[١٦٧] ئەوەیەکە کەسێك کە وابزانێت و وا ببینێت (فرحين بما اتاهم الله من فضله)، واتە :"ئەوانە خۆشحاڵن بەوەی خودای گەورە پێی بەخشیون لە فەزڵی خۆی".

بەشی دووەم:

سەرڤە موکتی، واتە ڕزگاربوونی گشت و توانەوە لە زاتدا و ئەمەش هەموو بونەوەرەکان دەگرێتەوە و پاش فەسڵانی گەورە و لەناوچوونی ئاسمانەکان و زەوی و بەهەشت و دۆزەخ و نەبوونی برەهماندە و نەبوونی ڕۆژو و شەو و ڕزگاربوونیان لە زاتدا، ڕزگاریان دەبێت، بە پێی دەقی ئایەتی پیرۆزی (و رضوان من الله اكبر ذلك هو الفوز العظيم) وە (الا ان اولياء الله لا خوف عليهم و لا هم يحزنون). واتە:"بەراستی کە عارفانی خودا ترسیان نیە و غەمگین نابن"، ئەمە ئاماژەیە بە هەمان موکتا.

167-واتە ئەوەی تا ئێرە لەم فەسڵەدا باس کراوە.

**بەش سێهەم:**

سارڤادا موکتی (**Sarvadamukti**) واتە ئازادبوونی هەمیشەیی.

سارڤادا موکتی ئەوەیە کە لە هەر قۆناغێکدا بگەڕێ، چ لە رۆژی خوداو چ لە شەوی خوداو چ لە جیهانی ناوەکی‌و چ لە جیهانی دەرەکی‌و چ لە برەهماندە خۆی دەربخات یان دەرنەخات، چ لە رابردوو چ ئێستا و چ لە داهاتوو کە بهوتا و بهاڤیشیا و ڤەرتەمانە ی پێ دەلێن، عارف ئازادو رزگاربوو بێت و لە هەر شوێنێك لە قورئانی پیرۆزدا لە مەسەلەی لە بەهەشت بووندا هاتبێت: (خالیدین فیها ابدا) ئەوە دەردەکەوێت . واتە هەمیشە و بۆ هەتاهەتایە لەبەهەشتدا دەبن. مەبەست لە بەهەشت زانینەو مەبەستیش لە وشەی (ابدا) واتە هەتاهەتایە ئەم کوتەیەیە. چونکە لە هەر قۆناغێکی بوندا بن ئامادەیی زانین و فەزڵی ئەزەلی لەودا هەیە و لە بارەی ئەم کۆمەڵەشەوە ئەم دوو ئایەتە پیرۆزە هەیە کە دەفەرموێت: (یبشرهم ربهم برحمة منهم و رضوان و جنات لهم فیها نعیم مقیم، خالیدین فیها ابدا ان الله عنده اجر عظیم). واتە خودای گەورە مژدەیان دەداتێ بە رەحمەتی خۆی‌و مژدەی فیردەوسی باڵایان پێ دەدات، بەهەشتێك کە بە بەخششی هەتاهەتایی و ئازادی بێ پچران رازاوەتەوە. بە راستی کە لای خودای گەورەیە پاداشتی گەورە.

(ویبشر المؤمنین الذین یعملون الصالحات لهم اجرا حسنا، ماکثین فیها ابدا). واتە مژدە بدە بەو باوەڕدرانەی کاری چاکە دەکەن، کە مەعریفەتی خوایان دەست دەکەوێت، بەراستی کە عارفان بە فیردەوس پاداشت دەدەینەوە و هەتاهەتایە لەوێ دەمێننەوە.

# باسی رۆژ و شەو

## ( رۆژ و شەوی خوداوەندی و ئاشکراو شاراوە ) [168]

بە پێی بیروڕای یەکتاپەرستانی هیند، ئەمەنی بڕەهما کە جبریلەو لەناوچوونی برەهماندە و ڕۆژی دەرکەوتن کە ڕۆژی خودایانەیە، هەژدە "ئابجا"ی[169] سالی دنیاییە و هەر ئابجایەك سەد "کرور"ە[170] بەپێی ئەم دوو ئایەتە پیرۆزە: (ان یوما عند ربك كألف سنه مما تعدون) واتە بە راستی کە رۆژێك لای پەروەردگاری تۆ وەکو هەزار ساڵە کە ئەهلی دونیا بیژمێرن.

وە ئایەتی : (تعرج الملائكة و الروح فی یوم كان مقداره خمسین الف سنة)، واتە فریشتەکان و رۆح ، کە رۆح بریتییە لە جبریل و برەهما،

---

168- لە ڕاستیدا ئەوەی داراشکۆ لێرەدا باسی کردووە، زۆر گرنگە و بیرتیژیەکی زۆری تیادا بەکار هێناوە لە یەکخستنی قیاساتەکانی هەر دوو ئایینی هیندۆیزم و ئیسلام و لە کۆتاییی مەقالەکەشدا ئەگەر سەرنج بدەیت دەبینی لەگەڵ ئاییینی مەسیحیەتیشدا یەك دێتەوە. ئەمەش نیشانەی دانایی و گەورەیی دارا شکۆیە کە زۆر ڕاستە و دەڵێت لە هیچ شوێنێکی تر ئەم زانیاریانە نابینی.

169-Abjha پێوانەیەکی کلاسیکی هیندیە.

170-Krur

دەگەڕێنەوە بۆ لای خودا لە ڕۆژێکدا کە ئەو ڕۆژە میقداری پەنجا هەزار ساڵە.

هەر ڕۆژێك لەم پەنجا هەزار ساڵە کە لە ئایەتەکەی پێشتردا باسی کراوە، کەواتە سەدساڵ تەمەنی جبریل و ماوەی دەرکەوتن و تەواوی جیهانەکە (برەهماندە)یە حساب دەکەین. هەر دە ئابجا ساڵ دونیایی کە هەر ئابجایەك سەد کرورە بێ کەم و زیاد، بەرابەرە بە حسابی یەکتاپەرستانی هیندستان.

تایبەتمەندی ژمارە هەژدە ئەوەیە کە لای ئەوان پلەکانی ژمارە سنوردارەو لە هەژدە بالاتریان پلە بۆ ژمارە دانەناوە. وە بەو قیامەتانەی کە ڕۆشتون و دەڕۆن دەڵێن "فەسلانی بچوك"[171] وەکو لافاوی ئاوو لافاوی ئاگر و لافاوی با. کاتێك ئەو ماوەیە تەواو بوو ڕۆژ بوو بە شەو فەسلانی گەورە دێت کە پێی دەڵێن ماهاپرالایا" Maha Pralaya" بەپێی ئەم دوو ئایەتە پیرۆزە:

(یوم تبدل الارض غیر الارض)

واتە ڕۆژێك کە زەوی بەزەویەکی تر دەگۆڕین.

(یوم نطوی السماء کطی السجل للکتب)

واتە ڕۆژێك کە ئاسمانەکان دەپێچینەوە وەکو پێچانەوەی کاغەز بۆ نوسین.

---

171- Khanda pralaya

پاش فەسلاّنی گـەورە مـاوەی شـەوی نـاوەکی کـە بەرابـەرە بـە رۆژی دەرکەوتن و توانەوەی هەمو جۆراوجۆرەکان کـە لـە حـەزرەتی زاتـدان، دیسان هەر دە ئانجای سالّی دونیایە.

ئاڤاستاتمان[١٧٢] کە بریتیە لە (سوشوپتاتانا) [١٧٣] کە جەبەرووتە، مـاوەی شەوی سوشوپتاتانای حەزرەتی زاتـە و ئـەو بەتالّـە لـە دروسـتکردن و دەرخستنی جیهان و ئەم ئایەتە پـیرۆزەش ئامـاژە بـەم سوشـوپتاتانایە دەکات:

(سنفرغ لکم ایها الثقلان) واتە نزیکە بەتالّ بینەوە لە ئێوە ئەی مرۆڤ و جنۆکەکان. وە حـەرزەتی زات لـە رۆژانـی دەرکـەوتنی جیهانـدا لـە مەقامی ناسوتدایە و لە قیامەتی بچوکدا لە مـەقامی مەلەکوتدایـە و لە قیامەتی گەورەشدا لە مەقامی جەبەروتدایە.

ئـەی خۆشەویـست ئـەوەی لـەم باسـەدا لـەپاش ووردبینیـەکی زۆر و لێکۆلینەوەی زۆر لام ئاشکرا بوو وە ئەم ئاشکراکردنە بەرابەر بـوو بـەم دوو ئایەتە پیرۆزە، لە هیچ کتێبێکداو لە هیچ کەسێ نایبیستی، ئەگەر بەگوێی هەندێ لە کەموکورتەکان گران بێت ئەوە من باکم نیە. [١٧٤]

(فان الله غنی عن العالمین)

---

172-Avasthmatman
173-Sushuptatana

174- وادیارە داراشکۆ زانیویەتی ئەم نوسینەی دەبێتـە بەلّگـە لەسـەری و فـەتوای کوشتنی دەدەن بۆیە دەلّێت باکم نیە.

# باسی بێ کۆتایی خولەکان

لای لێکۆڵەرانی هیند، خودای گەورە کە یەك شەوو یەك رۆژی هەیە، ئەم شەوە کە تەواو بوو دەبێتەوە رۆژ و رۆژیش کە تەواو بوو دیسان شەو دێتەوە[١٧٥] تا ناکۆتا و بەمەش دەڵێن "ئەنادی پرەڤەه"[١٧٦].

خواجە حافز رەحمەتی خوای لێ بێت ئاماژەی بەهەمان ناکۆتایی زەمەنەکان داوە و وتویەتی:

**ماجرای من و معشوق مرا پایان نیست**

**انچە اغاز ندارد ، نبذیرد انجام[١٧٧]**

---

175- ئەم بیروڕایەی دارا کە ویستویەتی بە ئایەتی قورئانی بیسەلمێنێتو هەندێ پێی ڕازین و هەندێکیش دژی دەوەستن، لە ڕاستیدا ڕێگەیەکی باشە بۆ کۆکردنەوەی هەردوو ئاین و تەنانەت زۆر لە فەلسەفەو بیرو ڕاکانی دیکەی تەنانەت جیهانی فەلسەفەی یۆنانیش کە باس لە ناکۆتابوونی جیهان دەکەن. لە بهاگافادگیتاشدا هاتووە کە بوونەوەر سەرەتا دەرنەکەوتوو بوو، لەپاشاندا دەرکەوتو دوایی دەبێتەوە بە دەرنەکەوتوو و بەم شێوەیە تا ناکۆتا دەروات.

176-Aadi pravah

177- چیرۆکی من و خۆشەویستەکەم کۆتایی نیە، ئەوەی سەرەتای نەبێ ئەنجامی نابێت.

وە هەموو تایبەتمەندیەکانی دەرکەوتنی زات و پەنهان بوونی کە لە رۆژو شەوی پێشتردا ڕووی داوە، بێ کەم و زیاد لە شەوو رۆژەکەی دیکەشدا ڕوو دەداتەوە بە پێی ئەم ئایەتە پیرۆزە: (كما بدأنا اول مره) واتە وەها کە لە یەکەم جاردا ئەو بونەوەرانەمان دەرخست کە لە ناومان بردبوون.
پاش تەواوبوونی خولی جیهان، دیسان ئادەمی باوکی مرۆڤایەتی دێتەوەو بۆ هەتا هەتایە بەم شێوەیە.[١٧٨] وە ئایەتی پیرۆزی (كما بدأكم تعودون) ئاماژە بە هەمان مانا دەکات. (واتە وەها کە یەکەمجار دروستمان کردوون دیسان بە هەمان شێوە دەتانهێنینەوە).
ئەگەر کەسێك گومان بکات لەوەی کە خاتەمییەتی پێغەمبەرەکەمان درودی خوای لێ بێت دەکەوێتە ژێر گومانەوە، دەڵێم کە لە ڕۆژێکی تریشدا دیسان پێغەمبەر درودی خوای لێ بێت دێتەوەو دەبێتەوە بە کۆتا پێغەمبەری ئەو ڕۆژە. وە ئەو فەرمودەیەی شەوی میعراجیش ئاماژەیە بۆ هەمان مانا کە پێغەمبەر درودی خوا لێ بێت کاروانی حوشترانی بینی کە بێ پچران دەڕۆشتن و لەسەر پشتی هەریەکیان دوو سندوق هەیە لە هەر سندوقێکدا جیهانێك هەیە وەکو ئەم جیهانەی

---

178- هەربۆیە لە ئایینی هیندۆزیدا چەندان مانوو واتە ئادەم دەبینی کە هەریەکیان پەیوەستن بە خولێکەوە. ئەم بیروڕایە ئەوەمان پێ دەڵێت کە بە هەزاران جاری دیکەش شارستانیەت و مەدەنیەت و تەکنەلۆژیاو ئەتۆم و من و تۆ هەبوین و ئەم وێنانە تازە نین و بەردەوام دووبارە دەبنەوە.

ئێمە و لە هەر جیهانێکیشدا موحەمەدێك هەیە. لە جبریلی پرسی کە ئەمە چیە؟ وتی: ئەی پێغەمبەری خودا لەو کاتەوەی مـن دروستکراوم دەبینم ئەم کاروانی حوشترانە بەم سندوقانەوە دەڕۆن و من هـیچ نـازانم کە ئەمە چیە. ئەمە ئاماژەیە بۆ ناکۆتایی خولەکان.

سوپاس بۆ خـوداو منـەتباری ئـەوم کـە تـوانیم ئـەم نامەیـەی (کـۆی دوودەریاکە) تەواو بکەم لە سالّی هەزارو شەشـسەد و پێنجـی هیجـری نەبەوی کە سالّی چل و دوەمینی تەمەنی ئەم هەژارە بـێ خەمـە محمـد داراشکۆیە. والسلام.

## زنجیرەی کتێبە چاپکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ساڵی 2011

| ناوی کتێب | نووسینی | وەرگێڕانی |
|---|---|---|
| ٥٦٠- چاوی گورگ | جەمیل توران | عەلی حوسێن |
| ٥٦١- هەزار خۆری درەوشاوە | خالید حوسەینی | ئازاد بەرزنجی |
| ٥٦٢-پەرلەمان و دیموکراسی لە سەدەی بیست و یەکەمدا | یەکێتی پەرلەمانتاریی نێو دەوڵەتی | هەڵکەوت عەبدوڵلا |
| ٥٦٣-بینای شوێن لە دوو ڕۆمانی کوردیدا | تانیا ئەسعەد محەممەد | |
| ٥٦٤- دادگایی | فرانتس کافکا | عەتا نەهایی |
| ٥٦٥- مێژووی وەرگێڕان | | د.ئەبوبەکر خۆشناو |
| ٥٦٦- فڕین بە مەزرای حەرامدا | ڕەئووف بێگەرد | |
| ٥٦٧- بە تەنیشت نمایشەوە | کامەران سوبحان | |
| ٥٦٨-فەرهەنگی زاراوەی هونەری | جەمال عەبدول | |
| ٥٦٩-نووسین هەڵوێستە | هەڵکەوت عەبدوڵلا | |
| ٥٧٠-سبەینێم دێتەوە یاد | دڵشاد عەبدوڵلا | |
| ٥٧١-تیۆژێ لە ئەدەب تیۆژێ لە سیاسەت | پشکۆ نجم الدین | |
| ٥٧٢- ڕوانگە | | |
| ٥٧٣- گرێکوێرەکانی فەلسەفە | فوئاد عەبدولڕەحمان | |

